# پێشەکی

## بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدالله رب العالمين.والصلاة والسلام على سيدنا و قدوتنا ومجاهدنا محمد صلى الله عليه وسلم وعلى أله وأصحابه أجمعين أما بعد :

**سوپاس بۆ الله تعالى كە ڕێگەی پێداین بەرهەمێكی تری بچوك بخەمەوە بەر دیدی یەك خوا پەرستان لە خوشك و برایانی زێدە ئازیز.هیوام وایە الله تعالى ئەم كارەم لێ وەرگرێ و بۆم بخاتە تووێشووی قیامەتێك كە هیچ كەسێك سوودی بۆت نابێ.ئەوەی كە ڕزگاریتە تەنها كردەوە چاكەكانتە.بەهۆی تەكلیفی چەند برایەكی شیرینم لە تۆڕە كۆمەڵایەتیەكان كە داوای ئەوەیان لێ كردم نووسینێك بنووسم لەسەر بابەتێكی گرنگی ئێستای یەك خوا پەرستان ئەویش : حوكمی ئەو نوێژانە چیە كە لەدوای كەسێك بكەیت كە فاسقە یان كافرە یان بیدعەچیە ؟ منیش پاش نوێژی بەیانیەك هەستام گەڕام بەدوای سەردەمە زێڕینەكان لە كتێبەكانی ئەهلی علم.بینیم لەوێ ئەم بابەتە بڕاوەتە و هەموومان بۆ ڕوون كراوەتەوە. پێویست بە نووسینی تر ناكات.تەنها كۆكردنەوە و ڕێكخستنێكی دەوێ.منیش هەستام بەڵگەكانم ئەوەی پێویست بوو كۆكردەوە.بۆ ئەوەی ئەم حوكمە شەرعیە لەسەر زاری زانایانی پێشین بگوازمەوە بۆ بەردەستی یەك خوا پەرستانی خۆشەویست.ئەویش دیارە بە هۆكاری زۆربوونی دەجال و مونافیق و كافرەكانی سەرمینبەر و پێش نوێژەوە. پێویستی كرد ئەم بابەتە ئامادە بكەین.وە بە هۆی نەبوونی هیچ كتێبێكی سەربەخۆ یان نووسینێكی سەربەخۆ لەم بابەتە.وە مامۆستایانی یەك خوا پەرستیش جار و بار لە دانیشتنەكانیان یان ئەوەی كە مینبەری هەبووبێ كەم كەم ووتەیەكی باس كردووە.لەم بارەیەوە.بەڵام ئەوەی من بزانم بە زمانی شیرینی كوردی ئەم بابەتە نەبووە.بۆیە منیش ویستم ئەگەر بە كەمێكیش بێت.باسێك لەسەر ئەم بابەتە كۆبكەمەوە.بەڵكو برایان و خۆشكانمان چاو ڕۆشن بن بەم بابەتە.هەر لە خۆیانەوە ڕانەكەن بەدوای هەركەسێ بێ نوێژبكەن.دەبێ ئاگاداربن.چوونكە نوێژ واجبێكە لە واجبەكانی ئیسلام.بە نەكردنی كافر ئەبیتەوە.جا بۆیە دەبێ ئاگاداری نوێژەكانمان بین و بزانین چۆن بۆ الله تعالى ئەنجامی دەدەین.چوونكە یەكێك لە بەتاڵ بوونەوەی نوێژەكانتان ئەوەیە كە ئەوەی كە دەیكەیتە ئیمام هیچ خاڵێكی خراپی لەسەر نەبێت.چوونكە ئەگەر هاتوو لەسەری بوو.ئەوە نوێژەكەت بەتاڵ دەبێتەوە و قبوڵ ناكرێت.**

جابۆیه به پێویستمان زانی ده‌ست پێش خه‌ری بكه‌ین له‌م بابه‌ته و كتێب نا به‌ڵكو نامیلكه‌یه‌كی بچوك ئاماده بكه‌ین.به ناونیشانی ﴿ نوێژ له دوای كێ بكه‌م ؟ ﴾ تێدا ووته‌ی زانایان كۆبكه‌مه‌وه و ڕوونیان بكه‌ینه‌وه.

ئه‌و نامیلكه‌ی كه له‌به‌ر ده‌سته بریتیه له : كۆكردنه‌وه‌ی هه‌ندێك له وته و ئاساواری پێشین.كاتی خۆی له‌سه‌رده‌می هاوه‌ڵان ئیمام و پێش نوێژ خوێنه‌كان پێغه‌مبه‌ر صلى الله عليه وسلم و ئه‌بوبكر و عومه‌ر و عوسمان و علی بوون.ئه‌م بابه‌ته له‌وكاتی بوونی نه‌بوو.به‌ڵام دوای شهید بوونی هه‌رچوار جێنیشه خۆشه‌ویسته‌كان.وه ده‌سه‌ڵات كه‌وته ده‌ست هه‌ندێ له سته‌مكارانی خیلافه‌ته‌كانی ئومه‌وی و عباسی و ..هتد وه سه‌ر هه‌ڵدانی بیدعه و له ئه نجام په‌یدابوونی خوارج و قه‌ده‌ری و جه‌همی و موعته‌زیله و ملحدین و سه‌دان تیره و گرووپی تری دوور له وه‌سیه‌ت و ئامۆژگاریه‌كانی پێغه‌مبه‌ر صلى الله عليه وسلم و هاوه‌ڵان و سێ سه‌ده زێڕینه‌كه.ئه‌م بابه‌ته درووست بوو.جا زانایان هه‌ستان به ڕێگری كردن و ئاگاداركردنه‌وه‌ی خه‌ڵك له‌م بابه‌ته و سه‌دان و فتوی و حوكمیان هه‌ڵێنجێنا له ده‌قی قورئان و سوونه‌ت له‌سه‌ر ئه‌م بابه‌ته و بۆ ئه‌وكات و ئێستاش بۆیته چاو ڕۆشنی بۆ ئه‌وه‌ی بزانین كێ ده‌كه‌ینه ئیمام بۆخۆمان.وه كێ شایسته‌یه به ئیمامه‌تی.جا بۆیه به پێویستمان زانی ئه‌م بابه‌ته‌تان بخه‌ینه به‌رده‌ستان و ئاگاداری دینه‌كه‌مان بین.

له كۆتایدا ده‌ڵێم : هیوامان وایه ئه‌م كاره‌مان ته‌نها له پێناو ڕه‌زامه‌ندی الله تعالى بێت و دووربێت له ڕق و كینه به‌رامبه‌ر هه‌ركه‌سێ.ئێمه گه‌ر ڕقمان له كه‌سێ بێت یان خۆشمان بووێت ته‌نها له پێناو الله تعالى یه.گه‌رنا دووژمنی هیچ كه‌س نین گه‌ر دوژمنایه‌تی دین و عه‌قیده‌مان نه‌كه‌ن.ئێمه ته‌نها و ته‌نها حاكمیه‌تی الله تعالى مان ده‌وێ بۆ سه‌رزه‌وی.وه هه‌وڵی گه‌ڕاندنه‌وه‌ی خیلافه‌ته‌كه‌ی خۆمان ده‌ده‌ین كه كافران و خاچ په‌رستان ڕووخاندیان.ئێمه سه‌رده‌مێك نیوه‌ی زه‌ویمان له ژێرده‌ست بوو.خۆش به‌ختیمان بۆ هه‌موو زه‌وی هێنا.به‌ڵام دوای نه‌مانی خیلافه‌ت.ناڕه‌حه‌تی و كێشه و كاره‌سات ڕووی له خه‌ڵك و زه‌وی كرد.جا بۆیه ئامۆژگاریتان ده‌كه‌ین به گه‌ڕانه‌وه بۆ قورئان و سوونه‌ت.وه دووربكه‌ونه‌وه له هه‌موو به‌رنامه و تاغوتێكی ماڵ كاول كه‌ر.

**داواکارین لە پەروەردگار هەموو برایان و خوشکانی یەك خوا پەرست بپارێزێ و ڕاگیراویان بکات لەسەر حەق.وە ئەو برا و خوشکانەشمان بە بەهەشت شاد بکات کە لە پێناو بەرزکر دنەوەی ئاڵای تەوحید و ئیسلام گەڕاوەنتەوە بۆلای ئارام ترین ئارامگا.کە ئەویش ژێر عەرشی الله تعالى یە.وە شەهیدیش ببەخشێت بە هەموومان...امین یارب العالمین.**

برا و خزمەتکارتان

باوکی ماریا

25_4_ساڵی_1440کۆچی... بەرامبەر...1_1_2019 میلادي

شوێن : کوردستانی باشوور

# ناوەڕۆك

## پێشکەشە بە :

یەکەم : بە دایك و باوکی ئازیزم.

دووهەم : مامۆستای کۆچکردووم.الله بیخاتە بەهەشتەوە.وە سەرجەم ئەو مامۆستایانەی سوودیان بۆمن هەبووە.

سێهەم : بەو خوشك و برا یەك خوا پەرستانەی.کە هاوکار و هاورێگامن بۆ گەیاندنی دەنگ و ڕەنگ و پەیامی تەوحید بە خەڵك.

چوارەم : بەهەموو ئەو کەسانەی کە حەقیان دەوێت و قبوڵی دەکەن.وە ببێتە هۆکارێك بۆ گەڕانەوەی خەڵکانێك کە دوورن لەم پەیامە پیرۆزە.

## کاری من لەو ناميلكەيە :

**برايان و خوشكانی ئەزيزم.من لێرەدا تەنها هەستاوم بە كۆكردنەوەی ووتە و بەڵگەكانی زانايانی پاش سەدەی دوو يان سێی هيجری دەربارەی ئەم بابەتە..وە زۆر بەكورتی باسم كردووە.بۆ ئەوەی خێرا بخوێندرێتەوە و تووشی بێزاربوون نەبن.من لە هەر بابەتێك ووتەی سێ يان چوار زانام هێناوەتەوە.بەڵام ئاماژەم بە سەرچاوەی قسەكان و بەڵگەكان كردووە.ئەمەش ڕێگايەكە بۆ ئەوەی زياتری لەسەر بخوێنيتەوە و بەدواداچوونی بۆ بكەيت.من تەنها ئاشنات دەكەم بەباتەكەو پووختەيەكی باسەكەت ئەخەمە دەستەوە بۆ ئەوەی ئاگاداری بابەتەكە ببيت.وە هەندێ جار پێويستی بە ڕوونكردنەوە دەبێت من ڕوونم كردۆتەوە.**

## ناميلكەكە دابەش دەبێت بۆسەر چوار بەش :

**يەكەم : پێناسەی پێنج زاراوە و ناساندنيان ئەوانيش :الامام...الاسلام... فاسق...البدع...الكافر.**

**لەبەر ئەوەی ئەو ئيمامەی كە پێش نوێژی دەكات لەم چوار شتە تێپەڕ ناكات.**

**دووهەم : حوكمی ئەو نوێژەی لەدوای ئەو ئيمامە كە ( فاسق و هەلی بيدعە ) چيە؟**

**لەبەر ئەوەی ( فاسق و بدع ) بەيەكەوە باس كردووە.چوونكە زانايان يەك حوكميان بۆ داناوە.وە يەك بڕياريان هەيە.**

**سێهەم : پوختەی قسەمان ( لەوێ باسی ئيمامەتی كەسی كافر يان هەڵگەڕاوە يان خاوەنی هەڵوەشێنراوەيەكی تەوحيد )م باسكردووە.وەلەبەر ئەوەش قسەی زۆرينەی زانايان لەسەر كەسی فاسق و بيدعەچيە.چوونكە ئەو سەردەمە ئەوە باوبوو.وە هەموويانيش كۆكن لەسەر نادرووستی كەسی كافر يان هەڵگەڕاوە يان خاوەنی هەڵوەشێنراوەيەكی تەوحيد.بۆ ئيمامەتی..ئەوەی كە جێی مشت و مڕبوو.بابەتی كەسی فاسق و اهل بدع بوو.**

**چوارەم** : وەڵامی چەند پرسيارێك لەم بابەتەوە

**پێنجەم : قسەی كۆتامان لەسەر بابەتەكە.**

**ئومێدم وايە سوودێكی كورت بگەيەنم بە ئێوەی خۆشەويست.**

# یەکەم :

## پێناسەی پێنج زاراوە

الامام. . .الاسلام. . . فاسق. . .البدع. . .الکافر.

**پێناسەی ( الاسلام ) له زمانەوانی و زاراوەی زانایان چیه ؟**

**له زمانەوانیدا :** من السلام أو من التسليم [1] **واته : ئاشتی یان ملکەچ بوون.**

**لەزاراوەی شەرع زانان : دوو پێناسەی هەیه :**

**یەکەم : بەشێوەی گشتی** ( الاسلام بمعنى العام ) **:=** هو التعبد لله بما شرع منذ أن أرسل الله الرسل الى أن تقوم الساعة [2]

**واته : پەرستنی پەروەردگاره لەو کاتەوەی که الله تعالى پێغەمبەرانی نارد بۆ هەموو بەشەریەت تاوەکو رۆژی قیامەت.**

**دووهەم : بەشێوه تایبەتیەکەی** ( الاسلام بمعنى الخاص ) **=:** ما بعث الله به محمد صلى الله عليه وسلم.ونسخ جميع الأديان السابقة.فصار من اتبعه مسلما ومن خالفه ليس بمسلم.فاتباع الرسل مسلمون فى زمن ورسلهم.فاليهود مسلمون فى زمن موسي عليه السلام.والنصارى مسلمون فى زمن عيسى عليه السلام.وأما حين بعث النبي صلى الله عليه وسلم.فكفروابه فليس بمسلمين [3]

**واته : ئەوەیه که پەروەردگار پێغەمبەری صلى الله عليه وسلم.نارد.بۆ هەموو جیهان.وه سەرجەم دینەکانی پێش خۆی هەڵوەشاندەوه.جا ئەو کەسەی بەدوای بکەوێت موسڵمانه و ئەو کەسەشی پێچەوانەی بکات.موسڵمان نیه.هەموو شوێنکەوتووانی پێغەمبەران لەسەردەمی خۆیان موسڵمان بوونه.وەك : شووێنکەوتووانی موسى لەسەردەمی خۆی موسڵمان بوونه.وه شووێنکەوتووانی عیسى لەسەردەمی خۆی موسڵمان بوونه.بەڵام کاتێ پێغەمبەری صلى الله عليه وسلم.ناردرا.ئەوەی کافربێت بەو.ئەوانه موسڵمان نینه.**

(1) معجم الوسيط_ص 345
(2) شرح ثلاثة أصول لابن عثيمين_ص 20
(3) شرح ثلاثة أصول لابن عثيمين_ص21

**پێناسەی** ( الكافر ) **لە زمانەوانی و زاراوەی زانایان چیە ؟**

**لە زمانەوانیدا :** من كفر يكفر كفرا أي : ستر الشيء.مثلا: كفر الفلاح القمح أى : ستر [4]

**واتە : دا پۆشین. نموونە : جوتیارەکە گە نمەکەی دا پۆشی لە ژێر زەویدا .**

**وە لە زاراوەی شەرع زانان :** لم يؤمن بالوحدانية الله.أو النبوة..أو الشريعة...الخ [5]

**واتە : ئیمان نەهێنان بە یەکتا پەرستی الله تعالى یان بە پێغەمبەران یان بە پەیامی ئیسلام..**

**پێناسەی** ( الامام ) **لە زمانەوانی و زاراوەی زانایان چیە ؟**

**لە زمانەوانیدا : پێشەوا ئیبن** منظور **دەفەرموێت** ( تأم به وأتم_مصدره _الامامة_جمعه _ أئمة ) [6]

كما قال تعالى ( **فقاتلوا أئمة الكفر** ) التوبة_ 12

**واتە : ئەوەی پێش ئەکەوێت و کارەکەی پێ تەواو دەکرێ......**

**لەزاراوەی شەرع زانان :**

**پێشەوا الفیروز ابادی دەفەرموێت :** الامام : وأمهم وبهم : تقدمهم . وهي : الامامة.والامام : ما أنتم به من رئيس وغيره. [7]

**واتە : پێشەوایەتی : ئەوەی کە پێش دەکەوێت.ئەوە پێی دەوترێ ( ئیمامەت ) ئەوەیە کە : دەبێتە سەرپەرشتیاری خەڵکانێك و غەیری ئەو...**

**پێشەوا : ڕازی دەفەرموێت :** وام القوم فى الصلاة.يؤم.اي : اقتدى به [8]

**واتە : ئەوە کەسە پێی دەوترێت ئیمام : کە لە نوێژ دەکرێتە پێشەنگ**

---

(4) معجم الوسيط _ ص 689
(5) معجم الوسيط _ ص 689
(6) لسان العرب_ج 12ص22
(7) القاموس المحيط_ج1 ص1392
(8) مختار الصحاح_ص20

**پێناسەی ( الفاسق ) له زمانەوانی و زاراوەی زانایان چیه ؟**

**له زمانەوانیدا :**

**پێشەوا الفیروز ابادی دەفەرمووێت :** الفسق : الخروج عن شيء [9]

**واته : دەرچوون له شتێك**

**لەزاراوەی شەرع زانان :**

**پێشەوا المرتضي الزبيدي دەفەرمووێت :** الفسق : الترك لأمرالله عزوجل.والعصيان والخروج عن طريق الحق أو هو الميل الي المعصية. [10]

**واته : واز هێنان له فەرمانی پەروەردگار و تاوان کردن و دەچوون لەسەر ڕێگای ڕاستی.یان : چوونی دڵ بۆ گوناه و تاوان**

**پێشەوا ابو النجا الحجاوی الحنبلي دەفەرمووێت :** الفاسق : من أتى كبيرة,أو داوم على صغيرة [11]

**واته : فاسیق ئەو کەسەیه که گوناهی گەورەی ئەنجام دابێت و بەردەوامیش بووبێت لەسەر گوناهی بچوك.**

**پێناسەی ( البدع ) له زمانەوانی و زاراوەی زانایان چیه ؟**

**له زمانەوانیدا :** كل ما أحدث واخترع وخلق [12]

**واته : هەر شتێك دابنرێت که پێشتر بوونی نەبووبێت وه درووستکراو بێت.**

**له زاراوەدا : جوانترین پێناسه بۆ بیدعه ئەو فەرموودە شیرینەیه که پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرمووێت** ﴿ من أحدث فی أمرنا هذا ماليس منه فهو رد ) [13]

**واته : هەرکەسێ شتێك له دین دابنێ وه فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێت ڕەت دەکرێتەوه.**

**واته دانانی شتێك بەسەر دینەوه که به هیچ شێوەیەك فەرمانی پەروەردگار و پێغەمبەرەکەی بەسەرەوه نەبێت.ئەگەر چی باشیش بێت.**

---

(9) القاموس المحيط_ ج1 ص1185
(10) تاج العروس_ج1 ص6549
(11) الاقناع_ج1 ص165
(12) معجم الرائد_ص653
(13) صحيح البخاری برقم :4066

**بیدعه چەند جۆرێك بەشی هەیە.هەیە وەك :**

**یەکەم : بیدعەی بیروباوڕ وەك : بۆ چوونی جەهمیەکان و موعتەزیلیەکان و ڕافیزیەکان و سەرجەم گرووپە گومڕاکانی تر.**

**دووهەم : بیدعە لە عیبادەت و پەرستشدا : زیادکردن و کەم کردنی نوێژی فەڕز و چەندینی تر...**

**وە هەیە وەك :**

**یەکەم : (** بدعة المكفرة **) واتە : ئەو بیدعەیی کە لە دین دەتباتە دەرەوە و کافر دەبیت وەك : هاوار و هانای غەیری خوا و قوربانی و تەواف بەدوای گوڕداو و وە بیدعەی خلق القران و وە نەفی کردنی بینینی الله تعالى لە بەهەشت.وە قسەی ئەوەی کە خەڵك بەهۆی گوناهی گەورەوە دەچێتە جەهەننەمەوە.وە تکفیری ابوبکر و عومەر و عوسمان.یان داواکردنی زانستی غەیب و بەشێوەیەکی گشتی لە (** شرك الاكبر **)..هتد**

**دووهەم : (** بدعة غير المكفرة **) واتە : ئەو بیدعەیی کە لە دین ناتباتە دەرەوە وەك : سوێند خواردن بە غەیری الله..یانی وەك : سوێند بە سەری باوکم یان فلان شێخ یان فلان گۆڕ بەشێوەیەکی گشتی لە (** شرك الاصغر **) ..هتد**

گه‌وره‌یی ( الامامة ) له شه‌ریعه‌تی ئیسلامدا :

**پێشه‌وا سه‌رخه‌سی ده‌فه‌رمووێت :** والأصل فيه أن مكان الامامة.ميراث من النبي صلى الله عليه وسلم.فانه أول من تقدم للامامة,فيختار له من يكون أشبه به خلقا وخلقا.ثم هو مكان استنبط منه الخلافة,فان النبي صلى الله عليه وسلم لما أمر أبا بكر أن يصلى بالناس.قالت الصحابة بعد موته : أنه أختار أبابكر لأمر دينكم فهو المختار لأمر دنياكم.فانما يختار لهذا المكان.من هو أعظم فى الناس ( 14 )

**واته : ئیمامه‌ت له بنه‌ڕتدا وه‌ك میراتێكی پێغه‌مبه‌ر صلى الله عليه وسلم.ماوه‌ته بۆمان.چوونكه ئه‌و یه‌كه‌م كه‌س بووه پێش كه‌وتووه بۆ ئیمامه‌ت.جا بۆیه ئه‌و كه‌سه‌ی كه ئه‌م پۆسته وه‌رده‌گرێ پێویسته له ڕه‌وشت و ئاكار به‌و بچێت.له دوایشدا ئیمامه‌ت جێگای هه‌ڵجینانی حوكمی ( خیلافه‌ت ) بووه.بۆ دوای پێغه‌مبه‌ر.هه‌روه‌ك پێغه‌مبه‌ر صلى الله عليه وسلم.له كۆتایی ته‌مه‌نیدا فه‌رمانی به ئه‌بوبكری سدیق كرد بۆ ئه‌وه‌ی ئیمامه‌تی بۆ خه‌ڵك بكات,ئه‌وه‌ش ئاماژه‌یه‌ك بوو به خه‌لیفه‌بوونی پێشه‌وا ئه‌بوبكر له دوای پێغه‌مبه‌ر صلى الله عليه وسلم.هه‌ر ئه‌وه‌ش بوو هاوه‌ڵان فه‌رموویان به ئه‌بوبكر : تۆ هه‌ڵبژێردرای بۆ ئه‌وه‌ی كار و باری موسڵمانان بگریته ده‌ست.ئه‌وه‌ش گه‌وره‌یی ئه‌بوبكر ده‌رده‌خات...**

كێ شایسته‌یه به ( ئیمامه‌ت ) ؟

**پێغه‌مبه‌ری خوا صلى الله عليه وسلم بۆمان دیاری ده‌كات كێ شایسته‌یه بۆ ئیمامه‌تی خه‌ڵك.كه له فه‌رمووده‌یه‌كی شیرین ده‌فه‌رمووێت** ( يؤم القوم أ قرؤهم لكتاب الله...فان كانوا سواء.فأعلمهم بالسنة..فان كانوا سواء.فأقدمهم هجرة...فان كانوا سواء.فأكبرهم سنا..وافضلهم ورعا )
وزاد عائشة...فان كانوا سواء,فأحسنهم وجها ) ( 15 )

**واته : كه‌سانێك ده‌بنه ئیمام كه زۆرترین قورئانی له‌به‌ربێت...ئه‌گه‌ر هاتوو هه‌موویان له قورئان وه‌ك یه‌ك بوون.ئه‌وه كێ زاناتره به سوونه‌ت... ئه‌گه‌ر هاتوو هه‌موویان له سوونه‌ت وه‌ك یه‌ك بوون.ئه‌وه كێ له پێشتره له كۆچ كردن.... ئه‌گه‌ر هاتوو هه‌موویان له كۆچكردن وه‌ك یه‌ك بوون.ئه‌وه كێ به‌ته‌مه‌نتره و وه به دینتره.**

**وه زیاده‌یه‌ك له فه‌رمووده‌ی دایه عائیشه هاتووه كه ده‌فه‌رمووێت : واته : ئه‌گه‌ر هاتوو هه‌ر یه‌كسان بوو ...كێ ڕووخساری جوانتربێت ئه‌و پێش ده‌كه‌وێت.**

(14) المبسوط _ ج1 ص40
(15) سنن البيهقى الكبرى ج3 رقم الحديث 5082_قال الألبانى : منكر, السلسلة الضعيفة ج2 برقم :609

**( الفسق ) دابەش دەبێت بۆ دوو جۆر :**

**یەكەم : فاسق بوونەكەی له كردەوە بێت.( الفسق من جهة العمل)**

**دووهەم : فاسق بوونەكەی له بیروباوڕ بێت.( الفسق من جهة الاعتقاد)**

**زانایان كۆكن لەسەر ئەوەی كە نوێژ له دوای ( الفسق من جهة الاعتقاد) واتە : فاسق بوون له ڕووی بیروباوڕەوە..بەهیچ شێوەیەك درووست نیە.**

**بەڵام ئەوەی كە جێی ڕا جیاوازیە ( الفسق من جهة العمل) واتە : فاسق بوون له ڕووی كردەوە**

**ئەزیزانم..ئەم بابەتە جێی مشت و مڕی زانایانە لە هەرچوار مەزهەب و زانایانی تر.وە سەرەتا باسی مەزهەبەکان دەکەین و سەیردەکەین بزانین لەبارەی نوێژکردن لە دوای ئیمامێکی فاسق و بیدعەچی چی دەفەرموون.دواتر دێین بەڵگەی مەزهەبەکان باس دەکەین.دواتر قسەی ڕاست هەڵدەبژێرین و باسی بەڵگەکەی دەکەین.**

یەکەم : لەمەزهەبی ئیمامی ئەبوحنیفە ( مذهب الحنفية )

**حەنەفیەکان دەفەرموون : نوێژکردن درووستە لە پشت فاسقێکی سەرپێچی کار لە فەرمانی پەروەردگار.بەمەرجێك ئەو کەسە ( بدعة المكفرة ) تێکەڵی نەبووبێت.**

**بەڵام لای هەندێك لە حەنەفیەکان : ناپەسەندە ( المكروه )**

**وەك پێشەوا سەرخسی دەفەرمووێت ( ويجوز امامة الأعمى..والأعرابي..والعبد..وولد الزنا...والفاسق.)** [16]

**واتە : درووستە کوێر و دەشتەکی و نەخوێنەوار و بەندە و منداڵی زینا و فاسق ئیمامەتی بکەن.**

**لە پاشان دەفەرمووێت ( قال أبويوسف فى الأمالي : أكره أن يكون الامام صاحب هوى أو بدعة..لأن الناس لايرغبون فى الاقتداء به )** [17]

**واتە : ئەبو یوسف لە امالی دەفەرمووێت : نا پەسەند و ناخۆشە ئیمام خاوەنی بیدعە و هەوا بێت,چوونکە خەڵك پێیان خۆش نیە بیکەنە پێشەنگ.**

**وە لە هەمان کتێبدا ( الامالی ) ئەبو یوسف دەفەرمووێت : ناپەسەندە کوێر و دەشتەکی و بەندە و فاسق پیش بکەون.. بەڵام گەرپێشیش کەوتن درووستە ) وە دەفەرمووێت ( کەسی فاسق باش نیە پێش بکەوێت چوونکە بۆتە پەڵەیەك بۆی لەدیندا )** [18]

(16) المبسوط_ج1 ص40
(17) المبسوط_ج1 ص41
(18) اللباب فی شرح الكتاب_ج1 ص22

**پێشەوا طحاوی له البدرالعینی بۆمان دەگێڕتەوە (** یجوز الاقتداء بالمخالف,وكل بر وفاجر .ما لم يكن مبتدعا بدعة يكفر بها.ومالم يتحقق من امامه مفسدا لصلاته فى اعتقاده.ثم قال : واذا لم يجد غير المخالف,فلا كراهة فى الاقتداء به.والاقتداء به.أولى من الانفراد..على أن الكراهية لاتنافي الثواب **)** [19]

**واته : درووسته كه نوێژ له دوای كەسی مخالفت بكەیت.وه نوێژ درووسته له دوای هەموو كەسێكی چاك و خراپ.مادەم نەبویته خاوەن بیدعەیەك كه له دینی بردبێته دەرەوە.وه هیچ بیروباوڕێكی خراپی نەبێت ببێته هۆی باتڵ بوونی نوێژەكەی.له پاشان فەرمووی : وه ئەگەر هات و مخالفت نەبێت له مەزهەب و دینت.هیچ شتێكی خراپی تێدانیه لەوەی كه بیكەیته پێشەنگ و ئیمامی خۆت.باشتره لەوەی به تاك نوێژ بكەیت.وه ناپەسەندی نابێته هۆكار بۆ نەبوونی بەدەست هێنانی پاداشت.**

**بەڵام ئەو كەسەی كه تێكەڵی بیدعەیەكی (** مكفرة **) نەبووە.ئەوە پێشەوا ئەبو یوسف ئیمامەتی ئەو كەسه به ناپەسەندی دەزانێ.هەروەك پێشەوا كاسانی لێی دەگێڕتەوە** [20] **وه پێشەوا كاسانی دەفەرمووێت : ئەبو یوسف فەرمووی : شێخەكەم ئەبو حەنیفه دەبینی له پشت هیچ ( مبتدع-فاسق)ێك نوێژی نەدەكرد** [21]

---

(19) حاشية الطحاوى على المراقي_ج2 ص299
(20) بدائع الصنائع_ج1 ص386
(21) بدائع الصنائع_ج1 ص386

دووهەم : لەمەزهەبی ئیمامی داری هیجرە پێشەوا مالیك ( مذهب المالكية )

**لای مالکیەکان فاسقی ئیمامیەت دوو جۆرە :**

**یەکەم : ﴿ فاسق بالجارحة ﴾ واتە : وە کەسێکی فاسق بە کردەوی ئەندامەکانی لاشە :**
**زیناکەر..مشروب خۆر..خراپەکار لەگەڵ دایك و باوك و جیران..هتد**

**دووهەم : ﴿ فاسق بصلاتە ﴾ واتە : ڕوکنێك لە ڕوکنەکانی نوێژ لابا و نەیهێڵێ.یان مەرجێك لە مەرجەکانی نەکات.**

**لای مەزهەبی مالیکی : ئەوەی ﴿ فاسق بالجارحة ﴾ی هەبێت.درووستە نوێژی لە پشت بکەیت,بەڵام ئەوەی ﴿ فاسق بصلاتە ﴾ هەبێت ئەوە نوێژی لە دوا درووست نیە و باتڵە دەبێت بیکاتەوە.[22]**
**پێشەوا ئەبو البرکات الدردیر هەمان شت دەگێڕتەوە [23]**

**بەڵام مالیکیەکان ڕەئی تریان هەیە لەسەر ئەو بابەتە بەپێی بەڵگەکان ئەوەیان درووستره وەك :**

**پێشەوا ئیبن ئیسحاقی مالکی دەفەرمووێت (** بطلت باقتداء بمن كافرا أو امرأة أو خنثى المشكل أو مجنونا أو فاسقا بجارحه أو محدثا..**)** [24] **واتە : نوێژەکەت بەتاڵە ئەگەر لە پشت :**
**کافرێك.یان..ئافرەتێك..یان..نێرە موکێك..یان..شێتێك..یان..فاسقێك بەکردەوە..یان..لەش گرانێك..بکەیت.**

**وە پێشەوا اللخمی مالیکی دەفەرمووێت : باش نیە نوێژکردن لە دوای هەردوو جۆر فاسق** [25]

---

(22) مواهب الجليل _ج2 ص92
(23) الشرح الكبير_ج1 ص327 ..حاشية الدسوقى_ج1 ص307
(24) مختصر خليل_ج1 ص40
(25) مواهب الجليل _ج2 ص92

**ئیبن بەشیری مالیکی دەفەرمووێت : نوێژکردن لە دوای فاسقێك دووحاڵەتی هەیە [26] :**

**یەکەم : درووست نیە و باتڵە**

**وەك : ئەگەر هاتوو گوناهی گەورەی ئەنجام دابوو.وەك : زینا و درۆکردن و خراپی لەگەڵ دایك و باوك و خواردنی ماڵی یەتیم و کوشتن..هتد.**

**دووهەم : درووستە**

**وەك : ئەگەر  هاتوو فیسقەکە پەیوەندی بە ئەحکام و مەرجی نوێژدا نەبێت.**

**پێشەوا ئیبن بەزیزەی مالیکی دەفەرمووێت : قسەی دیار و مشهور لای ئێمە ئەوەیە : نوێژ دووبارە دەکەینەوە ئەگەر هاتوو لە پشت ئیمامێکی خاوەن گوناهە گەورەکان بکەین.[27]**

**وە پێشەوا ئەبهەری مالیکی دەفەرمووێت : ئەگەر هاتوو گوناهی زۆر لەسەر کۆبوویەوە یان وازی لە ڕوکنێك هێنا یان بەهۆی تاویلێکەوە لە کاتی خۆی نەیکرد ئەوە نوێژی لەدوای بەتاڵە و دوووبارەی دەکەینەوە.**

**وە ئیبن حەبیبی مالیکی دەفەرمووێت : هەرکەسێ نوێژ لە دوای عارق خۆرێك کرد ئەوە دەبێ نوێژەکەی بکاتەوە چوونکە باتڵە,ئیلا ئەگەر خلیفەی موسڵمانان بوو دووبارە نایکەیتەوە چوونکە گوێڕایەڵی واجبە بۆی بەڵام بە مەرجێك لەکاتی ئیمامەتی سەرخۆش نەبێ,ئەگەر سەرخۆش بێت ئەوە نوێژەکە باتڵە.[28]**

---

(26)  مواهب الجليل _ج2 ص95
(27)  مواهب الجليل _ج2 ص93
(28) التلقين _ ج1 ص116

**ئیبن عەرەفەی مالیکی دەفەرموویێت (** ولا تجوز امامة الفاسق..ولا المرأة..ولا الصبي الا فى النافلة..ولا العبد فى الجمعة **)**[29] **واتە : درووست نیە نویژ لەدوای ئیمامێکی فاسق..وە ئافرەت...منداڵ ئیلا لە سونەت نەبێت وەك : نوێژە جەژنەکان..وە بەندەیەك لە نوێژی هەینی..بکەیت.**

**پێشەوا ئیبن رشد لە بدایە المجتهد دەفەرموویێت (** صحة امامة الفاسق فى النافلة فقط **)**[30]

**واتە : درووستە ئیمامەتی کەسی فاسق تەنها لە نوێژە سوننەتەکان.**

(29) مواهب الجليل _ج2 ص94
(30) بداية المجتهد _ ج1 ص226

سێهەم : لەمەزهەبی ئیمامی شافعی ( مذهب الشافعية )

**شافعيەكان لەگەڵ مەزهەبی حەنەفی كۆكن لەسەر ئەو بابەتە ( نوێژەكە بە درووست دەزانن بەڵام لە پشت ئیمامێكی فاسق بە ناپەسەند دەزانن.مەگەر بیدعەیەكی كوفری لێ ببینرێت..وە نوێژەكە دووبارە ناكەنەوە ئەگەر لە پشت فاسقێك بیكەن )**

**پێشەوا شافعی دەفەرموویێت (** أكره امامة الفاسق.والمظهر البدع.ومن صلى خلف واحد منهم أجزأته الصلاة.ولم تكن عليه اعادة.اذا أقام الصلاة **)** [31] **واتە : ئیمامەتی فاسق ناپەسەندە. وە ئەو كەسەش بیدعەی ئاشكرا دەكات..هەر كەسێ نوێژی لەدوای یەكێك لەوانە كرد ئەوە نوێژەكەی درووستە,وە دووبارەكردنەوی لەسەر نیە ئەگەر هاتوو نوێژی لەگەڵ كرد.**

**وە لەشوێنێكی تر دەفەرمووێت (**والعدل أولى بالامامة.وان كان الفاسق أفقه.على أن صلاة خلفه تصح**)**[32] **واتە : كەسی دادپەروەر و خۆپارێز لەتاوان لە پێشترە بۆ ئیمامەتی لە كەسێكی فاسق..بەڵام ئەگەر هاتوو كابرای فاسق شارەزاتربوو لەدین ئەوە ئەو پێش دەكەوێ وە نوێژ لەدوای درووستە.**

**پێشەوا شیرازی لە كتێبی (** المهذب **) دەفەرمووێت** ﴿ وتجوز الصلاة خلف الفاسق **)** [33]

**واتە : درووستە نوێژكردن لە دوای كەسی فاسق.**

(31) فقه العبادات _ ج1 ص407
(32) مغنى المحتاج _ ج1 ص237
(33) المهذب _ج1 ص183

## چوارەم : لەمەزهەبی ئیمام احمدی کوڕی حنبل ( مذهب الحنابلة )

حه‌نبلیه‌كان ده‌فه‌رموون : به‌هیچ شێوه‌یه‌ك ئیمامی فاسق نوێژی له‌دوا درووست نیه‌.جا ئه‌و فیسقه‌ چ كرده‌وه‌یی بێت یان بیروباوڕی.ئیلا بۆ نوێژی جومعه‌ و نوێژی جه‌ژنه‌كان ئه‌ویش له‌ عوزری ئه‌وه‌ی كه‌ هیچ ئیمام و ملا و مزگه‌وتێكی تر نه‌بوو بچیت نوێژی تێدا بكه‌یت.وه‌ له‌ترسی نه‌فسی خۆی له‌وه‌ی خه‌ڵكانێك یان دوژمنێك بیه‌وێ زه‌فه‌رت پێ به‌رێ ( یان وه‌ك : حاڵی ئه‌مڕۆی ئێمه‌ له‌ ترسی زیندان و بێ سه‌رشوێن كردن ) بۆیه‌ ده‌توانی نوێژی له‌دوا بكه‌یت,به‌ڵام له‌سه‌رت پێویسته‌ دووباره‌ی بكه‌یته‌وه‌ له‌و حاڵه‌تدا .

مه‌رعی كوڕی یوسف ده‌فه‌رموویێت ( ولا تصح امامة الفاسق.الا فی جمعة وعید.تعذرا خلف غيره ) [34]

واته‌ : درووست ئیمامه‌تی كه‌سی فاسق ئیلا له‌ بۆ نوێژی هه‌ینی یان نوێژی جه‌ژنه‌كان.به‌ڵام له‌كاتێكدا هیچ ئیمامێكی موحید نه‌بێت له‌ شوێنه‌كه‌.

وه‌ له‌ كتێبی ( الاقناع ) جارێكی تر پێشه‌وا مه‌رعی كوڕی یوسف ده‌فه‌رموویێت ( ولا يصح امامة الفاسق بفعل أو اعتقاد.ولو كان مستورا.ولو بمثله.علم فسقه ابتداء أولا.فيعيد اذا علم.وتصح الجمعة والعيد بلا اعادة.ان تعذرت خلف غيره.وان خاف أذى صلى خلفه وأعاد..وان نوى مأموم الانفراد.ووافقه فی أفعالها صح ولم يعد.حتى ولو جماعة صلو خلفه ) [35] واته‌ : درووست نیه‌ ئیمامه‌تی بۆ كه‌سی فاسق,جا فیسقه‌كه‌ی به‌ كرده‌وه‌ بێت یان بیروباوڕبێت.ئه‌گه‌ر هاتوو حاڵی ئه‌و ئیمامه‌ت لێ شاراوه‌ بوو و نه‌تناسی.زاهیره‌ن چاك بوو.ئه‌وه‌ ئه‌گه‌ر هاتوو فیسقه‌یی بۆت ئاشكرابوو له‌ پاش نوێژه‌كه‌.ده‌بێت نوێژه‌كه‌ت دووباره‌ بكه‌یته‌وه‌ پاش ئه‌وه‌ی كه‌ زانیت.به‌ڵام نوێژی هه‌ینی و جه‌ژنه‌كان له‌ دواوه‌ی درووسته‌.به‌بێ دوباره‌كردنه‌وه‌.ئه‌ویش به‌ مه‌رجێ هیچ ئیمامێكی موه‌حیدت وه‌ده‌ست نه‌كه‌وت...وه‌ ئه‌گه‌ر هاتوو له‌ ترسی گیانت نوێژت له‌ دوای كرد به‌هه‌ر هۆكارێك.ئه‌وه‌ ده‌بێت نوێژه‌كه‌ دووباره‌ بكه‌یته‌وه‌.وه‌ ئه‌گه‌ر هاتوو نوێژخوێن نیه‌تی هێنا له‌گه‌ڵ ئیمامێكی فاسق به‌ تاك,وه‌ موافق و پابه‌ند بوو له‌گه‌ڵ جووله‌كانی ئیمام,ئه‌وه‌ نوێژه‌كه‌ت درووسته‌ و دووباره‌كردنه‌وه‌ی ناوێت.ئه‌گه‌ر هاتوو بوویته‌ ئیمام بۆ خه‌ڵكانی پشته‌وشت.

(34) دليل الطالب _ ج1 ص90
(35) الاقناع _ ج1 ص165

وه ڕیوایەتێك له پێشەوا احمد هاتووه که دەفەرموویێت ( تصح خلف الفاسق بالعمل لا بالاعتقاد ) [36]

واته : درووسته نوێژکردن له دوای کەسی فاسق به کردەوه نەوەك به بیروباوڕ.

بەڵام پێشەوا المرداوی دەفەرموویێت : ئەو قسەی ئیمام احمد خیلافی لەسەره و دەرەجەی ڕیوایەتەکه زۆر بەهێز نیه. ئەوەی که مشهوره ( خلف الفاسق ) دوو ڕیوایەتی لەسەره :

ڕیوایەتی یەکەم : بەهیچ شێوەیەك درووست نیه.جا فاسقی کردەوه بێت یان بیروباوڕ.ئەوه قسەی زۆرینەی مەزهەبه وەك : ئیبن زاغوتی و ئیبن ئەبی موسی و والقازی و والشیرازی و ئیبن هەبیره و ئەبو ختاب و شەریف و ئەبو جعفر و ئەبوبکر و ئامەدی و مەجد و شێخ تقی الدین و ئیبن عەقیلیش..هتد

ڕیوایەتی دووهەم : ناپەسەنده بەڵام که کردیشت نوێژەکەت درووسته.ئەوەی که درووسته له نوێژه سوونەتەکانه.ئەوەش قسەی کەمێك له زانایانی حەنبەلین وەك : ئیبن تمیم ..هتد

حەنبەلیەکان : نوێژکردن له دوای ئیمامێك که خاوەنی گوناهی بچوك بێت به درووست دەزانن.بەڵام بەردەوام نەبێت لەسەر تاوانەکانی.

پێشەوا ئەبو نجا دەفەرموویێت ( ومن فعل ما يعتقد تحريمه فى غير الصلاة مما اختلف فيه كنكاح بلا ولى.وشرب نبيذ ونحوه.فان داوم عليه فسق.ولم يصل خلفه.وان لم يداوم.وهو من الصغائر.ولا بأس بالصلاة خافه ) [37] واته : هەرکەسێ کارێکی حەرام بکات,جگه لەناو نوێژ.ئەوەی که خیلافی تێدایه وەك : مارەکردنی ئافرەت بەبێ وەلی ئافرەتەکه یان خواردنی ماده سەرخۆشەکان.ئەگەر هاتوو لەسەری بەردەوام بوو ئەوه فیسقه و تاوانباره.ئەوکات نوێژی لەدوا درووست نیه.بەڵام ئەگەر لەسەری بەردەوام نەبوو,ئەو گوناهی بچوکی ئەنجام داوه.ئەوکات نوێژی لەدوا دەکرێت و هیچی تێدا نیه.

---

(36) الكافى فى فقه الحنبلى _ ج1 ص293
(37) الاقناع _ ج1 ص165

وه شێخی ئیسلام ئیبن ته‌یمیه ده‌فه‌رموویێت ( لايجوز أن يولى فى الامامة بالناس من يأكل الحشيشة أو يفعل من المنكرات المحرمة مع امكان توليه من هو خير منه )[38]

واته : درووست نیه كه‌سێك بكرێت به ئیمام ماده هۆشبه‌ره‌كان بخوات یات كارێكی حراٖم بكات..له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا بتوانن ئیمامێكی چاكتر دانێن.

سه‌بارەت به‌گه‌ڕانه‌وه و كردنه‌وه‌ی نوێژ له دوای ئیمامێكی ( فاسق ) لای حه‌نبه‌لیه‌كان ڕاجیاوازی تێدایه وه‌ك :

**یه‌كه‌م** : به موتڵه‌قی ده‌بێت دووباره‌ی بكه‌یته‌وه.

**دووه‌م** : پێویست ناكات دووباره‌ی بكه‌یته‌وه ئه‌گه‌ر هاتوو نه‌زان بووی به حاڵی و حاڵی ئاشكرا نه‌بوو.

**سێهه‌م** : ئه‌گه‌ر هاتوو فیسقه‌كه‌ی ئاشكرا و دیار بوو.ئه‌وكات دووباره‌ی ده‌كه‌یته‌وه.مه‌گه‌رئه‌وه‌ی كه عوزرێكت هه‌بوو.

**چواره‌م** : ڕاست ئه‌وه‌یه ئه‌گه‌ر فیسقه‌كه‌ی ئاشكرابوو ده‌بێت دووباره‌ی بكاته‌وه.

**پێنجه‌م** : دووباره‌كردنه‌وه‌ی ناوێت ئه‌گه‌ر نوێژی هه‌ینی یان جه‌ژنه‌كان بوو.ئه‌وویش به‌هۆی نه‌بوونی ئیمامی تر.

**شه‌شه‌م** : ئه‌گه‌ر به‌هۆكاری ترسی گیانت,یان هه‌ڕه‌شه‌یه‌كت له‌سه‌ربوو.یان هه‌ر هۆكارێكی تر.ئه‌وه ئه‌وكات له‌سه‌رت پێویسته نوێژه‌كه‌ت بكه‌یته‌وه.

**تێبینیه‌ك له‌سه‌ر خاڵی شه‌شه‌م** : دوباره‌كردنه‌وه‌ی نوێژه‌كه‌ت واباشتره له‌ماڵه‌وه بكه‌یت,له‌به‌ر بوونی فیتنه‌ی خه‌ڵكانێكی ناحه‌ز به‌سه‌رته‌وه و نه‌بێته جێی گومان و نیشانه‌ی پرسیار له‌سه‌رت.

قسه‌ی درووست ( قول الأرجح ) :

خاڵی یه‌كه‌مه له هه‌موو حاڵه‌تێك ده‌بێت دووباره بكه‌یته‌وه.

(38) مجموع الفتوى لابن تيمية _ ج23 ص341

## به‌ڵگه‌ی مه‌زهه‌به‌كان :

**یه‌كه‌م : به‌ڵگه‌ی ئه‌و كه‌سانه‌ی كه‌ ده‌ڵێن : درووسته‌ نوێژ له‌ دوای كه‌سی فاسق بكه‌یت.**

**أ_فه‌رمووده‌ی ئه‌بو زه‌ڕی غیفاری كه‌ ده‌یفه‌رموو : پێغه‌مبه‌ر صلى الله عليه وسلم.پێی ووتم (** كيف أنت اذاكان عليك أمراء يؤخرون الصلاة عن وقتها.أو يميتون عن وقتها ؟ قال قلت: فما تأمرني ؟ قال : صل الصلاة لوقتها.فان أدركتها معهم فصل.فانها لك نافلة **)** [39]

**واته‌ : ئه‌ی ئه‌بو زه‌ڕ چۆن ده‌بیت كاتێك ده‌سه‌ڵاتداره‌كانتان نوێژه‌كان له‌ كاتی خۆی ناكه‌ن.یان له‌كاتی خۆی ده‌یمرێنن ؟ ووتم : پێم ووت : ئه‌ی فه‌رمانی چیمان پێ ده‌كه‌یت ؟ نوێژ بكه‌ له‌گه‌ڵی له‌كاتی خۆی ئه‌گه‌ر هاتوو پێی گه‌یشتی.ئه‌وه‌ گه‌ر قبوڵیش نه‌بوو بۆت ده‌بێت به‌ سوننه‌ت.**

**ڕووی به‌ڵگه‌ی فه‌رمووده‌كه‌ : تاخیركردنی نوێژ له‌سه‌ر وه‌ختی خۆی به‌بێ هیچ عوزرێكی شه‌رعی به‌ ( فاسق ) بوون ده‌بژێردرێت.به‌ڵام له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا پێغه‌مبه‌ر صلى الله عليه وسلم. فه‌رمانی پێكرد نوێژ بكه‌ له‌ پشت ئه‌گه‌ر تاخیریشی كرد.ئه‌وه‌ش به‌ڵگه‌یه‌ له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی كه‌ نوێژه‌كه‌ درووسته‌.له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ئه‌گه‌ر هاتوو درووست نه‌بوایه‌ چاكه‌ی بۆ نه‌ده‌نووسرا ئه‌گه‌ر سوونه‌تێكیش بێت.**

**ب_ له‌ ئه‌بو هوڕیڕه‌وه‌ ڕه‌زای په‌روه‌ردگاری له‌سه‌ربێت.ده‌گێڕته‌وه‌ كه‌ پێغه‌مبه‌ر صلى الله عليه وسلم.ده‌فه‌رمووێت (** الجهاد واجب عليكم مع كل أمير,برا كان أو فاجرا.والصلاة واجبة عليكم خلف كل مسلم.برا كان أو فاجرا.وان عمل الكبائر.والصلاة واجبة على كل مسلم.برا كان أو فاجرا.وان عمل الكبائر.والصيام واجب على كل مسلم برا أوكان فاجرا.وان عمل الكبائر **)** [40]

**واته‌ : جیهاد و تێكۆشان واجبه‌ له‌سه‌رتان له‌گه‌ڵ هه‌موو ئه‌میرێك.چاك بێت یان خراپه‌كار.وه‌ نوێژ كردن واجبه‌ له‌سه‌ر هه‌موو موسڵمانێك.جا ئه‌و كه‌سه‌ چاك بێت یان خراپه‌كار.له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا گوناهی گه‌وره‌ش ئه‌نجام بدات. وه‌ نوێژ كردن واجبه‌ له‌سه‌ر هه‌موو موسڵمانێك.جا ئه‌و كه‌سه‌ چاك بێت یان خراپه‌كار.له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا گوناهی گه‌وره‌ش ئه‌نجام بدات.وه‌ ڕۆژووگرتن واجبه‌ له‌سه‌ر هه‌موو موسڵمانێك. جا ئه‌و كه‌سه‌ چاك بێت یان خراپه‌كار.له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا گوناهی گه‌وره‌ش ئه‌نجام بدات.**

---

(39) صحيح مسلم.برقم : 648...سنن أبي داود.برقم : 431

(40) سنن أبي داود.برقم : 22...سنن الدارقطني.برقم : 56...سنن البيهقي,برقم : 121..قال الألباني : ضعيف.في أرواء الغليل-ج2 ص304.برقم : 859

ت_عبدالله‌ ی كوڕی عومه‌ر ڕه‌زای خوای له‌سه‌ربێت.ده‌فه‌رموویت : پێغه‌مبه‌ر صلى الله‌ علیه‌ وسلم.فه‌رمووی ( صلوا على من قال : لااله‌ الا الله‌.وصلوا خلف من قال : لا اله‌ الا الله‌ ) [41]

واته‌ : نوێژی مردوو بكه‌ له‌سه‌ر هه‌موو كه‌سێك كه‌ ده‌ڵێت : لا اله‌ الا الله‌...وه‌ نوێژ بكه‌ له‌ دوای هه‌موو ئه‌و كه‌سه‌ی كه‌ ده‌ڵێت " لا اله‌ الا الله‌.

ث_ هاوه‌ڵان و تابعیه‌كان ڕێگریان له‌ حه‌جاجی یوسفی سه‌قه‌فی نه‌ده‌كرد كه‌ ئیمامه‌ت نه‌كا.له‌ نوێژی هه‌ینی بێت یان غه‌یری ئه‌و.له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا فاسقترین كه‌سی زه‌مانی خۆی بوو.هه‌تاوه‌كو پێشه‌وا حه‌سه‌نی به‌صری ده‌فه‌رموویت : ئه‌گه‌ر هه‌موو ئوومه‌تێك به‌هاتبان به‌ بیسیه‌كانی خۆیانه‌وه‌,ئه‌وه‌ ئێمه‌ی ئومه‌تی ئیسلام ته‌نها به‌ حه‌جاج بچووباین.ئه‌وه‌ پیسیه‌كه‌ی ئێمه‌ به‌سه‌ر ئه‌وانی تر زاڵ ده‌بوو [42] وه‌ گه‌وره‌ی گه‌نجانی به‌هه‌شت ( حه‌سه‌ن و حوسێین ) نوێژیان له‌ دوای ( خه‌لیفه‌ مه‌ڕوانی كوڕی حه‌كه‌م ) ده‌كرد.پێشه‌وا حه‌سه‌ن ده‌یفه‌رموو : نوێژ بكه‌ن.بیدعه‌كه‌ی بۆ گه‌رده‌نی خۆی [43] وه‌ نوێژیان له‌ دوای : زیاد و كوڕه‌كه‌ی كردووه‌...وه‌ له‌ دوای وه‌لیدی كوڕی عوقبه‌ كردووه‌,كه‌ ئه‌و وه‌لیده‌ مشروب خۆربوو.ئه‌وه‌ بۆته‌ اجماع لای ئه‌وان [44]

ج_ئیمامی بوخاری له‌ عوبه‌یدالله‌ ی كوڕی عه‌دی كوڕی خیار دگێڕته‌وه‌ فه‌رمووی : چووم بۆ لای عوسمانی كوڕی عه‌فان كاتێ له‌ماڵی خۆی زیندانی كرابوو .ووتم پێی : تۆ ئه‌ی عوسمان ئیمامی گشتی خه‌ڵكی.وه‌ تۆ ده‌بینی تووشی چی بووینه‌ له‌ ئاژاوه‌ و فیتنه‌...خه‌ڵكانێكی ئه‌هلی فیتنه‌ و فاسق نوێژمان بۆ ده‌كه‌ن. وه‌ ئێمه‌ حه‌زمان به‌ ئیمامه‌تیان نیه‌ و لێیان بێزارین.فه‌رمووی : ئه‌و نوێژه‌ چاكتره‌ كه‌ خه‌ڵك ده‌یكا..ئه‌گه‌ر هاتوو له‌گه‌ڵ خه‌ڵك باش بوون.له‌گه‌ڵیان باش بن..وه‌ ئه‌گه‌ر خراپ بوو لێان دووربكه‌ونه‌وه‌ [45]

---

(41) سنن الدار قطني.برقم : 57...وقال الألباني : ضعيف.في جامع الصغير وزيادته.ج1 ص792.برقم : 7920
(42) المبسوط_ج1 ص 40...بدائع الصنائع_ج1 ص386...المهذب_ج1 ص183...منار السبيل_ج1 ص90
(43) منار السبيل_ج1 ص90
(44) الشرح الكبير_ج2 ص24
(45) منار السبيل_ج1 ص94

**وه ئیمامی عوسمان فەرمانی كرد نوێژ له دوای ( كنانەی كوڕی بشر )بكەن كه یەكێك بوو له گەورەی خواریجەكان و وه یەكێك بوو لەوكەسانەی بژداربوو له زیندانی كردنی ئیمامی عوسمان.وه ئیبن حەجەری عەسقەلانی ئەم شته پشت ڕاست دەكاتەوه له ( فتح )كه دەفەرموویت : ئەوەش بەلگەیه له سەردەمی فیتنه دەست بگرن به مزگەوت و نوێژی به كۆمەڵەوه ئەگەر ئیمامكەشتان فاسق بوون.هەربۆیه نوێژكردن له پشت ئەو كەسەی كه خۆشت ناوێ باشتره نوێژی به كۆمەڵ لەكار بخەیت.**

**ح _ سواری كوڕی شەبیب دەفەرموویت : نەجدی حەڕوری یەكێك بوو له گەورەی خەواریجەكان هات له عێڕاقەوه هات بۆ حەج كردن بۆ مكه كه دەسەلاتداربوو.عبدالله ی كوڕی زوبەیر به پێشی خست.شەو ڕۆژێك ئیمامەت بۆ خەڵك كرد.ئیبن عومەر نوێژی له دوا كرد. ڕەخنەیان لێ گرت.وتیان : ئەی باوكی عبدالرحمن نوێژت له دوای نەجدی حەڕوری كرد ؟ ئەویش فەرمووی : ئەگەر هاتوو بانگی كردین بۆ باشترین كار,وەڵامی دەدەینەوه..بەڵام ئەگەر هاتوو بانگی كردین بۆ كوشتنی كەسێك ئێمەش دەڵێین : نا.وه دەنگمان لەسەری بەرزدەكەینەوه و ڕێگری لێدەكەین.**[46]

**وه هاتوه له ئیبن عومەرەوه كه پرسیاریان لێكرد : نوێژ له دوای كەسانێك دەكەی كه هەندێكیان ئەوی تریان دەكوژێ ؟ فەرمووی : ئەگەر بانگیان كردین بۆ نوێژ.وەڵامیان دەدەینەوه..وه ئەگەر بانگیان كردین بۆ سەر فرازی.وەڵامیان دەدەینەوه..وه ئەگەر بانگیان كردین بۆ كوشتنی برایەكمان یان خواردنی ماڵی برایەكان,پێی دەڵێین : نەخێر.**[47]

---

(46) رواه ابن أبي زمنين فى أصول السنة_ص284.برقم : 212

(47) رواه البيهقي في " سنن " برقم : 5088

**وە شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە دەفەرموێت : عبداللّه ی کوڕی عومەر و هەندێکی تر لە هاوەڵان نوێژیان لە دوای ( حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفی ) دەکرد و هیچ لە هاوەڵانی تر قسەیان نەدەکرد..وە صحابی و تابعییەکان نوێژیان لە دوای ( مختاری کوڕی ئەبی عوبەید ) دەکرد کە بریندارکرابوو بە ( الحاد ) و بانگخوازیەت بۆ گومڕایی.**[48]

**لەپاشان تابع تابعییەکان کە موافق بوون لەگەڵ سەلەف بە وتە و کردار کەچی ئەوانیش نوێژیان لە دوای ( مختار ) نوێژیان کردووە.هەروەك ئیمامی ئەعمەش دەفەرموێت : کیباری هاوەڵانی ئیبن مسعود نوێژو هەینیان لە پشت ( مختار ) کردووە.وە ئەبو وائیلیش بەهەمان شێوە نوێژی لە دواکردووە.**[49]

**پرسیاریان لە حەسەنی بەصری کرد دەربارەی نوێژکردن لە دوای کەسی بیدعەچی ؟ فەرمووی : نوێژی لە دوا بکەن.بیدعەکە بۆ خۆی.**[50]

**تێبینی :**

**بە دوو مەرج درووستە :**

**یەکەم : بیدعەکەی ( مکفرة ) نەبێت.**

**دووهەم : بانگخواز نەبێ بۆ بیدعەکەی.**

**وە هەروەها حەکەمی کوڕی عەتیە فەرموی : پرسیاریان لە ئیمام حەسەنی بەصری کرد و وتیان پێی : پیاوێك لە خواریجەکان ئیمامەتیمان بۆ دەکات.ئایە نوێژی لە دوا بکەین ؟ فەرمووی : بەڵێ بیکەن.خەڵکانێك ئیمامەتیان بۆ خەڵك کردووە لەوانە خراپتر.**[51]

---

(48) مجموع الفتوى لابن تيمية _ج3 ص281

(49) رواه ابن أبي شيبة في " المصنف "_ج1 ص475.برقم : 5497...وابن أبي زمنين في " أصول السنة " ص 284.برقم : 210

(50) رواه ابن أبي شيبة في " المصنف "_ج1 ص475.برقم : 5497...وعبدارزاق في " المصنف " ج 2 ص 386.برقم : 3798

(51) رواه ابن أبي زمنين فی أصول السنة_ص284.برقم :211

وە هەروەها ئیبن وضاح دەفەرموویێت : پرسیارم لە حارسی كوڕی مسكین كرد ئایا نوێژ لە دوای كەسی بیدعەچی بكەین ؟ ئەویش فەرمووی : نوێژی هەینی تایبەتە دەبێ كەسێكی یەك خوا پەرست بێت بەڵام نوێژەكاتی تر بەڵێ درووستە ( لێرە مەبەست لە بیدعەی غیر مكفرة )یە.[52]

وە هەروەها لە ئیبن وضاح دەفەرموویێت : پرسیارم لە یوسفی كوڕی عەدی كرد دەربارەی تەفسیری فەرموودەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ( صلوا خلف كل بر وفاجر ) ئەویش فەرمووی : تەنها هەینی تایبەتە منیش ووتم : ئەگەر هاتوو ئیمام خاوەنی بیدعەش بوو ؟ وتی : بەڵێ ئەگەر هاتوو خۆت خاوەنی بیدعەش بێت.لەبەر ئەوەی نوێژی هەینی تایبەتە.لەیەك شوێنە لە شوێنی ترنیە سەرپشكی ( مەبەست لە سەردەمی خیلافەتە لەیەك مزگەوتی شار جومعە دەكرا.بەڵام ئی ئێستا مزگەوت زۆرە دەتوانێ بچێتە شوێنی تر )[53]

وە هەروەها سوفیانی سەوری كاتێ وەصیەت بۆ شوعەیبی كوڕی حەرب دەكات.پێی دەفەرموویێت : ئەی شوعەیب هیچ سودی بۆت نیە ئەوەی بۆم نوسیوویت.هەتا نەت بینم نوێژ لە دوای هەموو ئیمامێكی چاك و خراپ بكەیت.شوعەیبیش وتیە سوفیان : ئەی باوكی عبدالله لە هەموو نوێژێك ؟ ووتی : نا.بەس نوێژی هەینی و جەژنەكان بكە.ئەوی تر خۆت سەرپشكی كە نوێژ لە پشت كێیەوە دەكەی.نوێژ مەكە ئیلا مەگەر ئەو كەسەی خۆت متمانەی پێدەكەی.وە دەبێ بشزانی لە ئەهلی سوونەت و جەماعەت بێت.[54]

وە هەروەها پێشەوا قودامەی مەقدیسی دەفەرموویێت : نوێژی هەینی و جەژنەكان لە پشت هەموو كەسێكی چاك و خراپ بكەن.چوونكە ئیمام احمد بەژداری نوێژی هەینی و جەژنەكانی لەگەڵ ( معتزیلەكان )ی كردووە.وە زانایانی ئەو سەردەم بەهەمان شێوە.لەبەر ئەوەشە ئەم نوێژی هەینی و جەژنەكان لە سیما و شیعارەكانی ئیسلامن.بۆیە زانایان و پیاوچاكان وازیان لێ نەهێناوە.ئەگەر ئیمامەكانیشیان بەدڵ نەبووبێ.بۆ ئەوەی بە تەواوەتی وای لێنێت وازی لێبهێنرێت.[55]

---

(52) رواه ابن أبي زمنين فی أصول السنة_ص284.برقم : 212
(53) رواه ابن أبي زمنين فی أصول السنة_ص284.برقم : 212
(54) رواه الالكائي في " أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة " ص : 154
(55) المغني _ ج 3 ص 22

**هەروەها پێشەوا نەوەوی دەفەرموویت : پێمان باش نیە نوێژ لە دوای کەسی بیدعەچی,بیدعەچیەك کە بیدعەکەی کوفر نەبێت.بەڵام گەرکرا درووستە.بەڵام ئەگەر بیدعەکەی کوفر و شیرك بێت.ئەوە درووست نیە نوێژی لە دوا بکەیت.وەك گشت کافرە ئەصلّی و هەڵگەڕاوەکان.**[56]

**دووهەم : بەڵگەی ئەو کەسانەی کە دەڵێن : نا پەسەندە نوێژ لە دوای کەسی فاسق بکەیت.**

**ا_ ئەوەی کە پێش دەکەویت.باوڕپێکراو نیە لای خەڵك و زانایان.ئەوەش قسەی پێشەوا شەربینی بوو لە شافعیەکان** [57]

**ب _ ئەو کەسانەی کە خەڵك بە ئیمامەتیان ڕازی نین.پەسەند نیە پێش بکەون.هەربۆیە بە ناپەسەندیان زانیوە.ئەوەش قسەی پێشەوایان.سەرخەسی و کاسانی لە حەنەفیەکان** [58]

---

(56) المهذب _ ج4 ص150
(57) مغني المحتاج _ ص: 237
(58) المبسوط _ج1 ص40

**سێهه‌م : به‌ڵگه‌ی ئه‌و كه‌سانه‌ی كه‌ ده‌ڵێن : درووست نیه‌ نوێژ له‌ دوای كه‌سی فاسق بكه‌یت.**

**ا _ په‌روه‌ردگار ده‌فه‌رموویٚت** ﴿ أفمن كان مؤمنا كمن كان فاسقا لايستون ﴾ السجدة_18

**ڕووی به‌ڵگه‌ی ئه‌م ئایه‌ته : له‌یه‌ك جیاكر نه‌وه‌ی كه‌سی ئیماندار و فاسق,ئه‌گه‌ر هاتوو نوێژی ئیماندار قه‌بوڵ بێت..ناش گونجێ نوێژی كه‌سی فاسق درووست بێت.چوونكه‌ په‌روه‌ردگار جیای كردۆته‌وه‌.كه‌واته‌ ده‌بێ له‌ هه‌مووشتێك جیا ببێته‌وه‌.**

**ب _ ئبن ماجه له‌ جابری كوڕی عبدالله‌ ی ده‌گێڕته‌وه‌ ئه‌ویش له‌ پێغه‌مبه‌ری خواوه‌ صلی الله‌ علیه‌ وسلم.كه‌ فه‌رموویه‌تی ( ....لا تؤمن امرأة رجلا,ولا أعرابي مهاجرا,ولا فاجر مؤمنا,الا أن يقهره بسلطان يخاف سوطه وسيفه..)** [59]

**واته‌ : درووست نیه‌.ئافره‌ت ئیمامه‌تی بۆ پیاوبكات.وه‌ ده‌شته‌كی بۆ كه‌سێكی كۆچكردوو..وه‌ كه‌سی خراپه‌كار بۆ ئیمانداریك..ئیلا مه‌گه‌ر ترسا له‌ قامچی و شمشێری ده‌سه‌ڵاتدارێكی زل هێز**

**ت _ ئه‌گه‌ر هاتوو فاسق خیانه‌ت و درۆی لێ ئاشكرابوو له‌ بابه‌تی دینه‌وه‌,جێی متمانه‌ نامینێ له‌ گرنگترین كاره‌كان وه‌ك : شهاده‌دانی لێ ساقیت ده‌بێ,له‌به‌ر ئه‌وه‌ی شایه‌تی ئه‌مانه‌ته‌.وه‌ ئه‌و كه‌سه‌ خیانه‌ت له‌و ئه‌مانه‌ته‌ ده‌كات.جا له‌نوێژ خراپتریشه‌.ئه‌وه‌ش قسه‌ی پێشه‌وا سه‌رخه‌سی و كاسانی بوو** [60]

---

(59) سنن أبن ماجه.برقم : 1081...وقال الألباني : حديث ضعيف.في " ارواء الغليل _ج2 ص303.برقم : 524

(60) المبسوط _ ج1 ص40

**چوارەم : بەڵگەی ئەو کەسانەی کە دەڵێن : درووستە نوێژی هەینی و جەژنەکان لە دوای کەسی فاسق بکەیت.**

**حەنبەلیەکان ڕێگەیان پێدا کە نوێژی هەینی و جەژنەکان لەدوای کەسی فاسق بکەن.ئەویش بەهۆی چەند بەڵگەیەك وەك ئیبن قدامە لە کتێبی ( المغنی ) دەیبژێرێت :**

**ا _ لەبەر گشتگیری وتەی پەروردگار کە دەفەرموویێت** ﴿ ...اذا نودی للصلاة من یوم الجمعة فاسعوا الی ذکرالله وذروا البیع ذالکم خیرلکم ان کنتم تعلمون ﴾ الجمعة_9

**ب _ ئیبن ماجە لە جابری کوڕی عبدالله ی دەگێڕێتەوە ئەویش لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم.کە فەرموویەتی** ( ...واعلموا أن الله قد افترض علیکم الجمعة في مقامي هذا,في یومي هذا,في شهري هذا.من عامي هذا, الي یوم القیامة,فمن ترکها في حیاتي أو بعدي,وله امام عادل أو جائر...... فلا جمع الله له شملة.ولابارك فی أمره..الخ) [61]

**واتە : ئەی خەڵکینە بزانن.بەڕاستی الله تعالی کردنی نوێژی هەینی لەسەرتانی واجب کردووە.ئا لەم شوێنە پیرۆزە..وە لەم ڕۆژەدا...وە لەم مانگەدا..وە لەو ساڵەدا..تا ڕۆژی قیامەت.جا هەرکەسێ وازی لێبهێنێ.لە ژیانم دا یان لەپاش منەوە.ئەگەر هاتوو ئیمامەکەشتان چاکەکاربوو یان خراپەکار...هەرگیز الله تعالی یەك ڕیزیتان پێ نابەخشێ..وە خێروبەرەکەت نامێنێ لەکارەکانتان..کۆمەڵێ سزا باس دەکات.بگەڕێنەوە بۆ فەرموودەکە.چوونکە دوورو درێژە**

**ت _ ئیجماعی سەحابە لەسەر ئەوەیە کە : عبدالله ی کوڕی عومەر لە پشت حەجاجی یوسفی سەقەفی نوێژی کردووە.وە هیچ پێچەوانەی نەوتووە و نەکردووە [62] وە پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل نوێژی لە دوای معتزلە کردووە وە لەگەڵ چەندین زانای هاوسەردەمی وەك : ئیبن معین و ئیبن المدینی و هتد [63] چوونکە نوێژ و نوێژی بە کۆمەڵ یەکێکە لە گەورەترین درووشمەکانی ئیسلام و موسڵمانان.هەربۆیە گرنگی پێدراوە و تەرك نەکراوە.**

---

(61) سنن أبن ماجه.برقم : 1081...وقال الألباني : حدیث ضعیف.في " ارواء الغلیل _ج2 ص303.برقم :
(62) المغني _ج2 ص149
(63) المغني _ ج2 ض27

## پوخته‌ی قسه‌مان :

**به پێی سه‌یرکردنی به‌ڵگه‌کان و ووته‌ی دروست و سه‌حیح ئه‌وه‌یه : که نوێژکردن درووسته له پشت که‌سی فاسق به پێی به‌هێزی به‌ڵگه‌کانیان وه‌ك : فه‌رمووده‌ی ئه‌بو زه‌ڕی غیفاری له باره‌ی تاخیرکردنی نوێژ له‌لایه‌ن ده‌سه‌ڵاتداره‌کانه‌وه.که له مسلم و نسائی و غه‌یری ئه‌و هاتوون.**

**هه‌رچی به‌ڵگه‌ی ئه‌وانه‌ی به درووستی نازانن لاواز و بێهێزن و جێی ئه‌وه نیه بکرێته به‌ڵگه و حوكمی له‌سه‌ر بینا بکرێت و وه به‌رگه ناگرن له‌به‌رامبه‌ر فه‌رمووده‌که‌ی ئه‌بو زه‌ڕی غیفاری.هه‌رچی ئایه‌ته‌که‌شه** ﴿ أفمن كان مؤمنا كمن كان فاسقا لايستون ﴾ السجدة_18 **لێره جیاوازی ده‌کات له پاداشت و سزا و ڕێز لای په‌روه‌ردگار.نه‌وه‌ك نوێژ و ئیمامه‌تی بۆ یه‌کتر.چوونکه له‌پاشان ڕوونتر ده‌کاته‌وه که ئیمانداران بۆ به‌هه‌شت و فاسقه‌کانیش بۆ دۆزه‌خ به‌پێی تاوه‌نه‌کانیان.که‌واته لێره جیاوازیه‌که له پاداشت و سزایه.**

**براکانم خوشکه‌کانم : ئه‌و خیلافه‌ی که باسمان کرد له سه‌ر که‌سێکی فاسقه واته : هه‌ڵگری گوناهی گه‌وره‌یه.که دیاره وه‌ك ئه‌هلی سوونه‌ت و جه‌ماعه‌ت ده‌فه‌رموون.که‌سیش به گوناهی گه‌وره کافر نابێت.به‌ڵکو ته‌نها فاسق ده‌بێت و ده‌بێته سه‌رپێچیکار به‌رامبه‌ر به په‌روه‌ردگار.ئه‌گه‌ر پێش مردنی ته‌وبه بکات و بگه‌ڕێته‌وه بۆلای په‌روه‌ردگار ئه‌وه له خۆشه‌ویسترین که‌سه‌کانی لای په‌روه‌ردگاره,وه ئه‌گه‌ریش له‌سه‌ر یه‌کێك له تاوانه گه‌وره‌کان بمرێت وه‌ك : زینا و کوشتن و .هتد ده‌چێته دۆزه‌خ به‌ڵام بۆ هه‌تا هه‌تایی نیه و ده‌چێته‌وه به‌هه‌شت.**

**ئه‌گه‌ر سه‌یری پێناسه‌که‌ی هه‌ریه‌ك له زانایان بکه‌یت که بۆ فاسقیان کردووه وه‌ك :**

**پێشه‌وا المرتضي الزبيدي ده‌فه‌رمووێت :** الفسق : الترك لأمرالله عزوجل.والعصيان والخروج عن طريق الحق أو هو الميل الي المعصية.

**واته : واز هێنان له فه‌رمانی په‌روه‌ردگار و تاوان کردن و ده‌چوون له‌سه‌ر ڕێگای ڕاستی.یان : چوونی دڵ بۆ گوناه و تاوان.**

پێشەوا ابو النجا الحجاوى الحنبلي دەفەرمووێت : الفاسق : من أتى كبيرة,أو داوم على صغيرة

واتە : فاسیق ئەو کەسەیە کە گوناهی گەورەی ئەنجام دابێت و بەردەوامیش بووبێت لەسەر گوناهی بچوك.

کەواتە لێرە باسی ( کفر ) نیە.

## ئەی حوکمی نوێژکردن لەدوای کافرێك یان هەڵگەڕاوەیەك چیە ؟

هەموو صحابی و تابعین و تابع تابعین و هەرچوار مەزهەبەکان و تێکڕای کۆکن لەسەر ئەوەی کە کەسێك کافربێت ئەصلی یان هەڵگەڕاوە ( مرتد ) یان یەکێك لە هەڵوەشێنراوەکانی کوفری تێدا بێت,پاش موانع و سوابیتی کافرکردن.هەرکەسێ جوێن بە پەروەردگار یان پێغەمبەرەکانی یان یەکێك لە ملائیکەتەکان یان قورئانەکەی یان سونەتی پاکی ڕەسولەکەی,ئەوە کافرە و دەرچووە لە بازنەی ئیسلام. ﴿ درووست نیە نوێژی لە دوای بکرێت و نوێژەکە باتڵە و واجبیشە دووبارە بکرێتەوە ﴾ ئەویش بە پێی وتەی ئەم زانایانە :

١ _ پێشەوا شافعی دەفەرمووێت ( الكافر لايكون اماما فى حال,والمؤمن يكون اماما فى الأحوال كلها.الا أنه ليس له أن يصلى الا طاهرا.وهكذا لو كان رجل مسلم.فارتد.ثم أم وهم مرتد.لم تجز من خلفه صلاته حتى يظهر التوبة بالكلام قبل امامتهم.فاذا أظهر التوبة بالكلام قبل امامتهم أجزأتم صلاتهم معه ) [64]

واتە : کافر بە هیچ شێوەیەك ناتوانێ ببێتە ئیمام.بەڵام کەسی ئیماندار لە هەموو کاتێك دەتوانێ ببێتە ئیمام.ئیلا مەگەر نوێژێ نەکا بە پاکی نەبێت.بە هەمان شێوە ئەگەرپیاوێکی موسڵمان.هەڵگەڕاوە لە دین.لە پاشان ئیمامەتی کرد وە هەڵگەڕابێتەوە.درووست نیە نوێژی لە پشت بکرێت.هەتاوەکو بە قسە تەوبە دەکات و ئاشکرای دەکات بۆ خەڵك.ئەگەر هاتوو پێش ئیمامەتی کردن تەوبەی ئاشکرای کرد .ئەوکات درووستە نوێژی لەگەڵ بکرێت.

---

(64) الأم_ج 1 ص 195

ب _ پێشەوا شیرازی دەفەرموویت ( ولا تصح امامة الكافر لأنه ليس من أهل الصلاة.فان تقدم وصلى بقوم لم يكن ذالك اسلاما منه.لأنه من فروع الايمان فلايصير بفعله مسلما.كما لو صام رمضان أو زكى المال.وأما من صلى خلفه : فان علم بحاله لم تصح صلاته.لأنه علق صلاته بصلاة باطلة ) [65]

واتە : ئیمامەتی کافر درووست نیە.لەبەر ئەوەی ئەهلی نوێژ نیە.ئەگەر هاتوو پێش کەوت و ئیمامەتی بۆ خەڵك کرد.تەنها زاهیر و ڕووکەش بوونی ئیسلامیەکەی نابێت,چوونکە فەرعی ئیمانە.تەنها بەکردنی چەند درووشمێکی ئیسلام نابێتە ئیماندار وەك : ڕۆژوو گرتن..یان زەکات دان..ئەگەر هاتوو نوێژت لە پشتیەوە کرد و ئاگاداربووی بە حاڵی.ئەوە نوێژەکەت درووست نیە,لەبەر ئەوەی نوێژی خۆت بەستەوە بە نوێژ و ئیمامێکی باتڵ.

ت _ پێشەوا ئیبن قدامە دەفەرموویت ( الكافر لا تصح الصلاة خلفه بحال.سواء علم بكفره بعد فراغه من الصلاة أو قبل ذالك.وعلى من صلى وراءه الاعادة.وهذا الرأى الشافعى وأصحاب الرأى و أبو ثورووقال المزنى : لا اعادة على من صلى خلفه وهو لا يعلم.لأنه أئتم بمن لا يعلم حاله...) [66]

واتە : کافر درووست نیە نوێژی لە پشتیەوە بکرێت.جا پاش تەواوبوونی نوێژەکە یان پێشی بە حاڵی ئاگاداربیت..وە هەر کەسێ نوێژی لە پشتیەوە کرد.لەسەری پێویتە دووبارە بکاتەوە.ئەوەش بۆچوونی پێشەوا شافعی و هاوەڵانی ڕەئی کە ﴿ ئەبا حەنیفە ﴾یە.وە ئیمام سەور..وە پێشەوا مزنی دەفەرموێت : پێویست ناکات ئەوەی لە پشتی نوێژی کرد.دووبارەی بکاتەوە.چوونکە تۆ لەسەر ئەوەبوویت کە نەزان بووی بە حاڵی.

(65) المهذب _ج 1 ص183
(66) المغني _ ج 2 ص16

ث _ ئیبن عوسەیمین دەفەرموویێت ( الكافر لاتصح الصلاة خلفه مطلقا.سواء كان كفره بالأعتقاد.أو بالقول.أو بالفعل.أو بالترك.
فالاعتفاد.مثل : أن يعتقد أن مع الله الها أخر...والقول.مثل : أن يستهزئ بالله أو رسله.أو دينه فهو كافر ولو كان يصلي..ونحن نعلم أنه لايمكن أن يصلى مسلم خلف كافر.لكن لو فرض أن شخصا صلى خلف رجل.ولم يعلم أنه كافر الا بعد الصلاة فهل تلزمه اعادة الصلاة أو لا ؟ الجواب : من العلماء من قال : انه لايعيد الصلاة. لأنه معذور...ومنهم من قال : بل يعيد الصلاة.لأن من شرط صحة الصلاة الامامة أن يكون مسلما.
ان كان علامة الكفر عليه ظاهرة لم تصح.ولم يعذر بالجهل لوجود القرينة...فالقول الراجح : ان كان جاهلا فان صلاته صحيحة ) (67)

واته : کافر بە هیچ شێوەیەك نوێژی لە پشت درووست نیە.جا ئەو کوفرەی بە بیروباوڕبێت یان بە قسە یان بە کردەوە بێت یان بە تەرك کردنی یەکێکیان بێت.

بیروباوڕ وەك : ئەوەی کە بڕوای وا بێت لەگەڵ پەروەردگار کەسێکی تر هەبێت و هاوبەش بێت لە ئیلاهیەت ( ئەوە کافری موتڵەقە )

قسەش وەك : ئەوەی گاڵتە بە الله و پێغەمبەرەکەی صلى الله عليه وسلم بکات ( بە سوونەتەکانیشی )وە بە دینەکەی ئەوە کافرە ئەگەر نوێژیش بکات.

تەرك وەك : ئەوەی نوێژ تەرك بکات لە قەولی درووست نوێژنەکەر کافرە.

ئێمە دەزانین کە نابێت موسڵمان نوێژ لە دوای کافرێك بکات.بەڵام گریمان کردی بەوەی کە : پیاوێك نوێژی لە دوای ( مەلایەك یان هەرکەسێکی تر) کردی وە نەیزانی ئەو کەسە یان ئەو مەلایە کافرە ئیلا پاش نوێژ زانی کە کافرە..ئایا لەسەری پێویستە نوێژەکەی دووبارە بکاتەوە یان نا :

**وەڵام** : هەندێ لە زانایان دەفەرموون : دووبارە نەکرێتەوە چوونکە عوزریان هەیە کە نەزانینی حاڵی ئەو ئیمامە بوو.. وە هەندێکی تر دەفەرموون : دەبێ دووبارە بکرێتەوە چوونکە یەکێك لە مەرجەکانی ئیمامەت ئەوەیە کە دەبێ موسڵمان بێت ( وە هیچ یەکێك لە هەڵوەشێنەرەوەکانی تێدا نەبێت ) وە ئەگەر نیشانەکانی کوفری لەسەر دیار بێت ئەوکات هیچ عوزرێکت بۆ نامێنێتەوە لەوەی کە نوێژی لە پشت بکەیت.لەبەر هەبوونی زانیاری لەسەر کوفرەکانی.بەڵام ئەگەر نەزان بوویت بە حاڵی ئەوە نوێژەکەت درووستە .

(67) الشرح الممتع _ ج4 ص220

**هەروەها ئیبن قودامە دەفەرمووێت (** وقد نص عن أحمد بن حنبل فان لم يعلم قدر ما عليه فانه يعيد حتى يتيقن براءة ذمته...وفي رواية عن صالح عن أحمد : يعيد حتى لايشك أنه قدجاء بما قد ضيع **)** [68]

**واتە : دەق هاتووە لە پێشەوای فەرمووودەناسان ئیمام ئەحمدی کوڕی حەنبەل : ئەگەر هاتوو نەیزانی بە حاڵی ئەوە نوێژەکەی دووبارە بکاتەوە تاوەکو بەری بێت لە هەرچیەك لە دڵ و کردەوە و مێشکی هەیە...وە لە ڕیوایەتێکی تردا : دووبارەی بکاتەوە تاوەکو وا گومان نەبا کە نوێژەکەی بە زایە چووە .**

**کەواتە ئەو مشت و مڕەی کە لە سەر ئەو بابەتە هاتووە باس لەسەر کەسی فاسقە نەوەك کافر.جا چ کافری ئەصڵی بێت یان یەکێك لە هەڵگەڕاوە یان هەڵوەشێنراوەکانی لێ هاتبێتە جێ.ئەوە بە اجماع نوێژ لە دوای درووست نیە.**

**بەڵام پرسیارێك دێتە پێشەوە ئەویش ئەوەیە : باشە ئەوڕۆکە ملاکانمان زۆربەی حیزبین یان ملای عەلمانیە ؟ یان ملای ئیسلامیە ؟ نوێژ لە دوای ئەوانە درووستە ؟**

**وەڵام : براکەم و خوشکەکەم.ئەوانەی کە لەسەرەوە باسمان کرد وەك قاعیدە وەری بگرە.ئەو ملایە فاسق بوو یان کافربوو یان هەڵگەڕاوە بوو یان هەڵوەشێنراوەکی لێ هاتە جێ ئەوە نوێژکردن درووست نیە لە پشت ئەو ملایە..عەلمانیەکە هیچ پەیوەندی بە ئیسلامەوە نەماوە,,ئەوەشی ئیسلامیەکەیە ئەگەر هاتوو هەڵوەشێنرەوەکی لێ هاتە جێ نوێژی لە دوا مەکە.**

**وە پرسیارێکی تر : ئایا گەر نوێژم لە دوای کەسێکی کافر کرد و زانیم کە کوفری صەریحی هەیە دەتوانم نوێژەکە دووبارە بکەمەوە ؟**

**وەڵام : هەمان ئەو ڕێگایانەی کە لەسەرەوە باسمان کرد لە دووبارەکردنەوەی نوێژەکان ئەتوانی بیگریتە بەر و بەپێی کوفر و فیسقی ئیمامکە نوێژەکەت دووبارە بکەوە.وە لە پێشتر چۆنیەتی دووبارەکردنەوەکانمان باس کرد.**

---

(68) المغني _ ج1 ص 439

**چەند پرسیارێك لەسەر ئەم بابەتە :**

**یەکەم : باشە ئەگەر ئیمامی مزگەوتێکم نەناسی و نەم زانی چ عەقیدەیەکی هەیە.ئەمڕۆکەش ملای مرتد و حیزبی زۆربوونە چی بکەم ؟**

**ج _ ئەو بابەتە پێی دەڵێن ( مستور الحال ) شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە دەفەرموێت (** يجوز للرجل أن يصلى الصلوات الخمس والجمعة وغير ذالك خلف من لم يعلم منه بدعة ولا فسقا باتفاق الائمة الأربعة وغيرهم من أئمة المسلمين.وليس من شرط الانتمام أن يعلم المأموم اعتقاد امامه ولا أن يمتحنه فيقول : ماذا تعتقد ؟ بل يصلى خلف مستور الحال **)**[69]

**واتە : درووستە بۆ پیاوێك هەر پێنج نوێژە و جومعەکان لە پشت کەسێك بکات کە نەزانی بە کوفر و بیدعەکەی وە فاسق بوونەکەی وە ( کافر بوونەکەی ) بە کۆدەنگی زانایانی هەرچوار مەزهەب وە غەیری ئەوانیش لە زانایانی ئیسلام.مەرج نیە بۆ کەسی مەئموم و نوێژ خوێن عقیدەی ئیمامەکەی بزانێت.وە بۆشی درووست نیە بچێت تاقی بکەیتەوە بە پرسیارێك بۆ نمونە ( پەرلەمان کوفرە ؟ فلانت پێ کافرە ؟ فلانت پێ باشە ؟ : کەزۆرێك لە گەنجەکان کەوتوونەتە ئەو هەڵەیەوە ) نوێژی لە دوا بکەن بە حاڵی بزربوویەوە.**

(69) مجموع الفتوى _ج 23_ض351

**دووه‌م : ئێمه‌ لای ماڵی خۆمان مه‌لایه‌كمان هه‌یه‌ له‌ هه‌ندێ وتاره‌كانی دوعا بۆ ( سه‌ركرده‌یه‌كی تاغوت ده‌كات ) به‌ مه‌دح و پیا هه‌ڵگوتن وه‌ك : الله بیپارێزێ...سه‌ری بخات..شوێن كه‌وتووان و سه‌ربازانی بپارێزێ..یان جار و بار دوعای هیدایه‌تی بۆ ده‌كات. ئایا درووسته‌ نوێژ له‌ دوای ئه‌و كه‌سه‌ ؟ وه‌ ئایا ده‌كرێ پرسیاری لێبكرێت له‌ ده‌رباره‌ی هۆكاری دوعاكانی ؟**

**ج _ ڕوایه‌ت كراوه‌ له‌ ئیبن ئه‌بی دونیا له‌ كتێبی ( الصمت ) وه‌ پێشه‌وا به‌یهه‌قی له‌ كتێبی ( شعب الایمان ) كه‌ : ئیمام حه‌سه‌نی به‌صری فه‌رموویه‌تی ( من دعا لظالم بالبقاء.فقد أحب أن يعصى الله عز وجل ) واته‌ : هه‌ر كه‌سێ نزا بۆ زاڵم و تاغوتێك بكات به‌ مانه‌وه‌.پێم خۆشتره‌ سه‌رپێچی الله تعالى بكه‌م پێم باشتره‌ له‌ نزاكه‌.**

**دوو جۆره‌ :**

**یه‌كه‌م : دوعا كردن به‌ مه‌دح و پێدا هه‌ڵگوتن ئه‌وه‌ درووست نیه‌ نوێژ له‌ دواوه‌ی.**

**دووه‌م : دوعا كردن به‌ هیدایه‌ت,ئه‌وه‌ درووسته‌ نوێژی له‌ دوا بكه‌یت.**[70]

**سێهه‌م : ئایا درووسته‌ نوێژ له‌ دوای ( الرافضة [71] )وه‌ بكه‌یت ؟**

**ج _ ئه‌بو یوسفی قازی ده‌فه‌رموویێت : نوێژ درووست نیه‌ له‌ پشت ڕافزیه‌كان**[72]

**هه‌روه‌ها ئه‌بی یه‌علا ڕیوایه‌ت ده‌كات له‌ ئیمام ئه‌حمد كاتێ پرسیاریان لێكرد ده‌رباره‌ی نوێژكردن له‌ دوای كه‌سێكی بیدعه‌چی ؟ ئه‌ویش فه‌رمووی : درووسته‌ .ئیلا به‌مه‌رجێ جه‌همی و ڕافزی نه‌بن** [73]

---

(70) الجواب : شيخ ابن باز _ فتوى اللجنة الدائمة رقم الفتوى___ابن باز268657

(71) ئه‌و شیعه‌ زیاده‌ڕۆ یانه‌ن كه‌ كاتی خۆی چوون بۆلای زه‌یدی كوڕی علی كوڕی حوسه‌ینی كوڕی ئیمام علی.به‌وه‌ی كه‌ ده‌بێ جوێن و ته‌عن له‌ ئه‌بوبكر و عومه‌ر بده‌یت.ئه‌وه‌بوو زید ڕه‌فزی كرده‌وه‌ و ڕازی نه‌بوو به‌و قسه‌یه‌.بۆیه‌ ناو له‌م شیعه‌ توندڕه‌وانه‌ نرا ( الرافضة )..بۆ زیاتر زانیاری سه‌یری ( الملل والنحل.للشهرستاني ) بكه‌

(72) شرح اصول السنة_ج2_ص 733

(73) طبقات الحنابلة_ج1ص168

**درووست نیە نوێژ لە دوای کەسی موشریك بکەیت.ئەوانەی کە : داوا و هانا بۆ جگە لە الله دەکەن.یان ئەوانەی دەڵێن : مدد یا حسین یا علی یا عبدالقادر الجیلانی..هتد**

**وە یان : هەر ئیمامێك زانیت کە ڕۆچووە لە ال البیت.درووست نیە نوێژی لە دواوە بکەیت.**(74)

**چوارەم : درووستە نوێژ لە دوای ( جەهمیەکان**(75) **)ەوە بکرێت ؟**

**ج _ شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە دەفەرموویێت : جێگیربووە لە پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل کە نوێژی لە دوای جەهمیەکان کردووە.چوونکە پێشەوا ئەحمەد عەوامی جەهمیەکانی کافر نەکردووە.وە نەی وتووە ئەوەی جەهمی بێت کافرە.یان ئەوەی موافق بێت لەگەڵ جەهمیەکان.ئیمام ئەحمد نوێژی لە دوا کردوون و حەج و جیهادیشی لەگەڵ کردوون و گوێڕایەڵی کردوون لە چاکە**(76)

**بەڵام ئیبن قودامە لە ( مغنی ) هێناویەتی لە ئەبی داود دەگێڕتەوە کە : پرسیارکرا لە ئیمام ئەحمد دەربارەی نوێژ لە دوای جەهمیەکانەوە بەتایبەت نوێژی هەینی ؟ فەرمووی : من نوێژەکە دووبارە دەکەمەوە.هەرکەسێ بڵێ قورئان مەخلوقە نوێژەکەی لە دوای دووبارە دەکەمەوە** (77)

**هەروەها پێشەوا بەربەهاری دەفەرموویێت : هەر پێنج نوێژە فەرزەکە بکە لە پشت هەموو کەسێك وە درووستە..بەڵام بە مەرجێ جەهمی نەبێت.لەبەر ئەوەی سیفاتی پەروەردگاری داڕماندووە..ئەگەر هاتوو نوێژت لە دوای کرد.دووبارەی بکەوە ..یان ئەگەر هاتوو ئیمامی نوێژی هەینیت جەهمی بوو و وە دەسەڵاتداربوو.نوێژەکەت لە دوای بکە..بەڵام دواتر دووبارەی بکەوە** (78)

---

(74) فتوی لابن باز_ج2 ص396

(75) **شوێنکەوتەی جەهمی کوڕی صەفوان بوون. کە سالی ئەحوەزی لە ساڵی 121 کۆچی کوشتوویەتی.ڕێچکەی ئەمانە لە سیفەتەکانی خوای گەورە پەك دەخەن.وە لە قەدەریشدا بڕوایان وایە.مرۆڤەکان ناچارن بۆ ئەوەی ئەم کالرە بکەن یان نەیکەن.**

(76) مجموع الفتوی لابن تیمیة_ج7 ص507

(77) مغني_ص438

(78) شرح_السنة_ص49

**هەروەها ئەبو یوسفی قازی دەفەرمووێت : نوێژ درووست نیه له پشت جەهمیەکان**[79]

**سەلامی کوڕی ئەبی موتیع دەفەرمووێت : جەهمیەکان کافرن و درووست نیه نوێژکردن له دوایانەوه**[80]

**هەروەها پرسیارکرا له عبداللەی کوڕی ئیدریس : درووسته نوێژکردن له دوای جەهمیەکانەوه ؟ ئەویش فەرمووی : ئایا ئەوانه موسڵمانن ؟ نەخێر.کەواته درووست نیه نوێژکردن لەدوای کەسی کافرەوه** [81]

**هەروەها له وەکیعی کوڕی جەڕاحەوه دەفەرمووێت : بەهیچ شێوەیەك درووست نیه نوێژکردن له دوای جەهمیەکان**[82]

**هەروەها ڕیوایەت کراوه له یەحیی کوڕی مەعین : نوێژی هەینی دووبارەکردۆتەوه کاتێ له پشت مەئمومی خەلیفەی عەباسیەکانەوه نوێژی کردووه** [83]

**هەروەها ئەبی یەعلا ڕیوایەت دەکات له ئیمام ئەحمد کاتێ پرسیاریان لێکرد دەربارەی نوێژکردن له دوای کەسێکی بیدعەچی ؟ ئەویش فەرمووی : درووسته .ئیلا بەمەرجێ جەهمی و ڕافزی نەبن** [84]

**وه** شیخ عبدالطیف ال الشیخ **دەفەرمووێت : هەموو ئەهلی علم کۆکن لەسەر تەکفیرکردنی جەهمیەکان.وه درووست نیه نوێژکردن له دوای جەهمیەکی کافر.وەك به ڕیوایەتی صەحیح هاتووه له عبداللەی کوڕی ئەحمەدەوه که باوکی نوێژی هەینی دووباره کردۆتەوه له پشت جەهمیەکان** [85]

**کەواته بەهیچ شێوەیەك درووست نیه نوێژکردن له دوای جەهمیەکانەوه.**

---

(79) شرح اصول السنة_2_733
(80) السنة_لعبدالله_بن_احمد ج1ص105
(81) السنة_لعبدالله_بن_احمد ج1ص113
(82) السنة_لعبدالله_بن_احمد ج1ص115
(83) السنة_لعبدالله_بن_احمد ج1ص130
(84) طبقات الحنابلة_ج1ص168
(85) الدرر السنية_ج3ص409

**پێنجەم : ئایا درووستە نوێژکردن لە دوای ( القدرية [86] ) کانەوە ؟**

**ج_ ئیمامی لالکائی ڕیوایەت دەکات لە وائیلەی کوڕی سەقع : کە دیارە پرسیاری لێکراوە دەربارەی نوێژکردن لە دوای قەدەریەکانەوە ؟ ئەویش فەرمووی : درووست نیە نوێژکردن لە دوای قەدەریەکان.ئەگەر هاتوو نوێژیش کرا دەبێ دووبارە بکرێتەوە [87]**

**وە هەروەها ڕیوایەت کراوە لە یەساری کوڕی ئەبی حەکەم : درووست نیە نوێژکردن لە دوای قەدەریەکان.ئەگەر هاتوو نوێژیش کرا دەبێ دووبارە بکرێتەوە [88]**

**هەروەها پرسیارکرا لە ئیمامی داری هیجرە مالکی کوڕی ئەنەس : ئایا درووستە نوێژ لە دوای قەدەریەکان ؟ ئەویش فەرمووی : نوێژ مەکەن لە دواوەی..وتیان : ئەگەر نوێژی هەینیش بوو ؟ فەرمووی : بەڵێ.ئەگەر ترسان لە زەبری هێزیان نوێژ بکەن بەڵام دووبارەی بکەنەوە [89]**

**هەروەها ئەبو یوسفی قازی دەفەرموویێت : نوێژ درووست نیە لە پشت قەدەریەکان[90]**

**هەروەها پرسیارکرا لە ئەبی سەور دەربارەی نوێژکردن لە پشتیانەوە ؟ فەرمووی : هەرکەسێ بڵێ : الله تعالى کردەوەی بەندەکانی درووست نەکردووە..وە گوناه و تاوان لە قەدەری مرۆڤ نەنوسراوە..وە درووست نەکراوە لە لایەن پەروەردگارەوە...ئا ئەوانە قەدەرین.نوێژیان لە پشت مەکەن..وە سەردانی نەخۆشەکانیان مەکەن..وە ئامادەی ناشتنی مردووەکانیان مەبن..وە دەبێ داوای تەوبەیان لێبکرێت لەو قسانە..ئەگەر تەوبەیان نەکرد..دەبێ لە ملیان بدرێت.[91]**

---

(86) کەسانێکن دەڵێن : قەزاو قەدەری پەروەردگار هیچ پەیوەندیەکی بە کردەوەکانی بەندەوە نیە.وە باوڕیان وایە.بەندە ویست و توانی سەربەخۆی.خۆی هەیە.بەدەر لەوویست و توانای خوای گەورە.وە یەکەم کەسیش ئەم قسەی ناو خەڵك بڵاوکردەوە و وتی ( هەعبدی کوڕی ئەلجوهەنی )بوو.لە کۆتای سەردەمەکانی هاوەڵان بوو.کە ئەویش ئەم قسەیەی لە ئاگر پەرستێکی خەڵکی شاری بەصرە.وەرگرت.

(87) شرح_اصول_اعتقاد_اهل_السنة_والجماعة_ج1ص731

(88) شرح_اصول_اعتقاد_اهل_السنة_والجماعة_ج1ص731

(89) مدونة_الكبري_ج1ص84

(90) شرح اصول السنة_2_733

(91) أصول_السنة_ج2ص720

**وه جێگیربووه له موعازی کوڕی موعاز که دەفەرموویێت : نوێژم له پشت پیاوێك کرد له هۆزی سعد بۆ ماوەی چل یان سی ساڵ..دواتر پێم گەیشت که ئەو ئیمامه قەدەریه..نوێژی هەر چل یا سی ساڵەکەم کردەوه** [92]

**شەشەم : هەندێ برا هەن نوێژ له دوای مەزهەبی بەرامبەر ناکەن نمونه : ئەوانەی لەسەر مەزهەبی شافعین نوێژ له دوای حەنەفیەکان ناکەن..یان حەنبەلیەکان له دوای مالکیەکان وه به پێچەوانەوەش ئایا ئەو شته درووسته ؟ جیاوازی مەزهەب دەبێته ڕێگر لەو شته ؟**

**ج _ سەرەتا ئەوه بزانن شێخ** ولی الله الدهلوی **دەفەرموویێت : له سەردەمی هاوەڵان و تابعیەکان و دوای ئەوانیش جیاوازی و اختلاف هەبووه نمونه : هەندێ له هاوەڵان و دوای ئەوان (** البسملة واتة : بسم الله الرحمن الرحيم **) له نوێژەکانیان خوێندوویەتیان هەندێکی تر نەیان خوێندووه.هەندێ بەدەنگ خوێندوویەتیان هەندێکی تر به بێدەنگی خوێندوویانه..هەندێکیان قنوتیان له نوێژی بەیانی خوێندووه..هەندێکیان نەیان خوێندووه...هەندێکیان له دوار حیجامه و ڕشانەوه دەست نوێژیان گرتۆتەوه..هەندێکی تریان نەیان شووشتۆتەوه..هەندێکیان دەست نوێژیان به دەست دان به ئافرەت و عەورەت و شوێنی پیساییەکان گرتۆتەوه..هەندێکیان نەیان گرتۆتەوه..وه هەندێکیان له پاش خواردنی گۆشتی وشتر دەست نوێژیان گرتۆتەوه..هەندێکی تریان نەخێر.....کەچی هەموشیان نوێژیان له پشت یەك کردووه جیاوازی بیروڕا نەبۆته ڕێگر لەو شته.**

**بەهەمان شێوه خودی ئیمام شافعی نوێژی له دوای حەنەفیەکان و ئیمام مالیك و ئیمام ئەحمەدکر دووه.وه ئیمامەکان محمد حسن شەیبانی و ئەبو یوسف نوێژیان له پشت شافعی و مالکیەکان کردووه..وه ئیمام ئەحمەد نوێژی له پشت هەموویانی کردووه..سەرەڕای ئەو هەموو جیاوازیانەی که هەیان بووه.**

---

(92) السنة_لعبدالله_بن_احمد_ج2ص386

**چه‌ند نمونه‌یه‌ك له باخچه‌ی ئه‌و مه‌زهه‌بانه :**

**یه‌كه‌م : ئه‌بو حه‌نیفه هاوه‌ڵانی له‌گه‌ڵ پێشه‌وا شافعی نوێژیان له پشت مالكیه‌كان كردووه.كه ئه‌وان بسم الله.. ناخوێنن نه به نهێنی نه به ئاشكرا..كه‌چی لا حه‌نه‌فی و شافعیه‌كان ده‌بێ بخوێندرێت به ئاشكرا.**

**دووهه‌م : خه‌لیفه هاڕونه ڕه‌شید حیجامه‌ی كردوو یه‌كسه‌ر ئیمامه‌تی كرد.وه پێشه‌وا مالیك فه‌رمووی : درووسته.ده‌ست نوێژ نوشۆیته‌وه. ئه‌بو یوسف نوێژی له دواكرد و دووباره‌ی نه‌كردووه.كه‌چی له مه‌زهه‌بی ئه‌و ده‌شكێ.**

**سێهه‌م : لای ئیمام ئه‌حمه‌د ده‌بێ دوای حیجامه ده‌ست نوێژ بشۆیته‌وه چوونكه ده‌شكێ.دواتر پێی وترا : ئایا ئیمامێك خوێنی لێهات له لاشه‌ی وه ده‌ست نوێژی نه‌شوشته‌وه ئایا نوێژه‌كه درووسته بیكه‌ین ؟ فه‌رمووی : چۆن نوێژ ناكه‌م له دوای ئیمام مالیك و سعیدی كورشی موسه‌یه‌ب.واته : به‌ڵ درووسته له‌سه‌ر مه‌زهه‌بی مالیك و سعیدی كوڕی موسه‌یب.ئه‌گه‌رچی لای منیش درووست نه‌بێت.**

**چواره‌م : پێشه‌وا شافعی كاتێ چووه به‌غدا نوێژی به‌یانی له نزیك گۆڕی ئه‌بو حه‌نیفه كرد وه دوعای قنوتی نه‌خوێند له‌به‌ر ئه‌ده‌ب و حوڕمه‌تی مه‌زهه‌ب و گۆڕی ئیمام ئه‌بو حه‌نیفه.چوونكه له مه‌زهه‌بی ئه‌و ناخوێندرێت..وه ووتی : جاروبار ده‌چینه سه‌ر مه‌زهه‌بی خه‌ڵكی عێڕاق.**

**چواره‌م : ئه‌بو یوسف پێش ئه‌وه‌ی بچێته نوێژی هه‌ینی.چووه حه‌مام و خۆی شوشت ئینجا ڕۆیشت..كاتێ ته‌واو بوو.هه‌واڵیان پێدا كه ئاوی حه‌مامه‌كه مشكێكی تۆپیوی تێدایه.له ناو بیری حه‌مامه‌كه وه ئه‌و ئاوه‌ی خۆی پێ شوشت پیسه..دواتر ئه‌بو یوسف وتی : ئه‌وڕۆكه ده‌چینه سه‌ر قسه‌ی براكانمان له ئه‌هلی مه‌دینه ( مه‌به‌ستی مالكیه‌كان بوو ) كه : ئه‌گه‌ر هاتوو ئاو گه‌یشته قوله‌ته‌ین پیسی هه‌ڵناگرێ.**[93]

(93) هه‌موو نمونه‌كانی سه‌ره‌وه له‌م كتێبه سه‌یربكه_ الاختیارلتعلیل_المختارج1ص55

**لە کۆتایدا دەڵیین :**

**داواکارین لە الله تعالی ئەم کارە بچووکەمان لێوەرگرێت و بیخاتە تەرازووی چاکەکانمان.وە هەرچیەکمان وتبێت و کردبێت تەنها لە پێناو ڕەزامەندی خۆی بێت.براکانم و ئەزیزانم و یەك خوا پەرستان.ئەوەی باسمان کرد.تەنها حوکمی ئەو نوێژەیە کە لە دوای ئیمامێکی ناشایستە دەکەین.بەڵام تەرك کردنی نوێژی بە کۆمەڵ لەمزگەوتەکان بە هیچ شێوەیەك درووست نیە و ڕێگە پێنەدراوە,بەبیانووی ئەوەی کە گشت ملاکان حزبین و سەربەدەسەڵاتن.ئەگەر دەزانیت ئەو ملایەی کە نزیك ماڵتانە.کەسێکی ناشایستەیە بۆ ئیمامیەت.بڕۆ بۆ شوێنی تر.بێ ئەوەی بپێچیتەوە لە عەقیدەی ملای تر.کە نایناسی.گرنگ ئەوەیە دانەبڕێیت لە مزگەوت و نوێژی بە کۆمەڵ.چوونکە فەرموودەکان زۆر تاکید دەکەنەوە لەوەی کە نوێژی بە کۆمەڵ ئەنجام بدەیت.وە چوواندنی بەبێ هۆکار هەڕەشەی ترسناکی لەسەرە.بۆیە تەرك کردنی جومعە و جەماعەت.کارێکی ترسناکە.بەداخەوەم کە گەنجێکی زۆر بەبێ هیچ بەلگەیەکی شەرعی خۆیان دوورخستووە.بۆیە دەبێ هۆشیاربین و ئاگاداربین لە دینەکەمان.بەبێ زانست و زانیاری هەنگاوی بۆ نەنێین.وە هۆشیاربین لەوەی کە سۆز و دەمارگیری زاڵ بێت بەسەرمان.بۆیە ئومێدم وایە ئەم کورتە باسە ببێتە هۆکارێك بۆ ئەوەی لەم بابەتە هەندێك شارەزابین و چاوڕوون بین.وە ئومێدم وایە الله تعالی لە من و گشت خوێنەران ڕازی بێت و کۆمان بکاتەوە لە بەهەشتە نەبڕاوەکەی.لە خزمەت پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاوچاکان.**

**سوپاس بۆ الله تعالی ئەم بابەتەم لە شەوی هەینی ساڵی 1440 کۆچی.لە شاری ڕانیەی خۆشەویست تەواوبووم**

# سەرچاوەکان

**یەکەم** : القران الكريم

**دووهەم** : كتب الستة : صحيح البخارى و مسلم.سنن ابى داود.سنن ابن ماجة.سنن نسائي.سنن ترمذي
ارواء الغليل للألباني

**سێهەم** : كتب اللغة منهم : لسان العرب لابن منظور..معجم الوسيط..القاموس المحيط..مختار الصحاح للرازي..تاج العروس..معجم الرائد..

**چوارەم** : كتب الفقهية المذاهب الأربع منهم : حاشية الطحاوى على المراقي..بدائع الصنائع...مواهب الجليل...مختصر خليل...الشرح الكبير...بداية المجتهد...مغني المحتاج...المهذب...الاقناع...المغني لابن قدامة الحنبلي...دليل الطالب...الكافي في فقه الحنبلي...منار السبيل..الأم للشافعي...الشرح الممتع لابن عثيمين...

**پیپنجەم** : كتب العقيدة والأثار منهم : مجموع الفتوي لابن تيمية...أصول السنة للحميدي...مصنف لابن شيبة...أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة للالكائي...طبقات الحنابلة...السنة لعبدلله بن أحمد بن حنبل...الدرر السنية لعلماء النجد...الاختيار لتعليل المختار..فتوي لابن باز...وفتوي لابن عثيمين...

